# ڕۆژهەڵاتناسی

## لەنێوان ستراتیژی داگیرکاری و ئایدیۆلۆژیای ستەمدا

کاوە هاوراز

هەولێر - چاپی یەکەم ٢٠٠٣

# ڕۆژهەڵاتناسی

## لە نێوان ستراتیژی داگیرکاری و ئایدیۆلۆژیای ستەم دا

کاوە هاوڕاز

لە بڵاوکراوەکانی نوسینگەی تەفسیر / هەولێر

ناوی کتێب: رۆژهەڵاتناسیی لەنێوان ستراتیژیی داگیرکاری و ئایدیۆلۆژیای ستەمدا..
ناوی نوسەر: کاوە مصطفی محمد-هاوڕاز-
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
تایتڵی بەرگ: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٣ك ٢٠٠٣ز
چاپکردن: چاپخانەی پەروەردە
تیراژ: ١٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٤٥٦ ساڵی ٢٠٠٢

هەولیر- شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥-٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# چرپەیەک

## پرۆسەی گۆڕانکاریی‌و ڕۆڵی فیکر

داخۆ نهێنیی بەزین و لێک ترازانی هەندێک " کۆمەڵگەی ئینسانی " لە چی‌یەوە سەرچاوەی بگرێت نەخاسمە دوای ئەوەی سەردەمانێک لەسەر سەکۆی ئازادی‌و لەبەر چراخانی سەربەرزی‌دا ژیابن ؟ ! وەڵێ ڕوو وەرچەرخانیان لە ئیلتیزام و فراوان بوونی کە لەبەرەکانی بێ باکی‌و غەفڵەت دیارترین دەرفەت دەداتە دەست دوژمنانیان، تا پێش ئەوەی غەزوی نیشتمانیان بکەن غەزووی قووڵایی ناخیان بکەن..

ئەو بارودۆخە شێواوەش، کە گۆڕانکاری فیکری‌و سیاسی لە دەرەوەی سنورەوە بۆیان دەخولقێنێت، هەرگیز بەمیکانیزمی سەربازی‌و تەنانەت ئابووریش ناخولقێت. جا هەر دەبێت ڕۆڵی فیکریی ساغ و خاوێن بەگەڕ بخرێتەوە تاکو سەرلەنوێ بونیادێکی مەنهەجیی پتەو بۆ ململانێی حەتمی داڕێژرێتەوەو بەرلەوەی بەشداریی شەڕی چارەنوس بکرێت، هەربەچەکی فیکر گەشترین ڕوخسار لە ئاوێنەی ڕەفتاری مرۆییماندا پیشان دەین. گرنگی ڕۆڵی فیکریش هەر لە قالبێکی تیۆری‌دا نی‌یە ؛چونکە وەک بیریارە هاوچەرخەکانی ئەم نەتەوەیەش جەختیان لەسەر کردووە؛ دەبێت بە لۆژیکی سەردەم (دروستیی فیکر نەک لەسەر ئاقارە فەلسەفی‌و ئەخلاقی‌و زانستی‌یەکانی، بەڵکو سەرەتا لە ئاقارێکی عەقائیدیی پوختەوە هەڵقولێت تا سەرکەوتن و دەسکەوت و هۆیەکانی پاراستنیشی وەک کوتلەیەکی خەیاڵ نەمێنێتەوە.

ئەمەیە ڕۆڵی فیکر لە پڕۆسێسی گۆڕانکارییدا.. ئیدی دامەزراندنی دەزگاو ڕێکخراوو ناوەندی لێکۆڵینەوەو هۆیەکانی تری گەیاندن، کاروچالاکییان لەسەر ڕەوڕەوەی خوازراویان دەبێت. تەنهاو تەنها- ئیلتیزام- حوکم دەکات ... " ئیلتیزام " بەفیکری ساغ و داڕێژراو.. نەك بە تاکە کەسێك یان گروپێك.. یان ئیدارەیەکی- کاتی حوکمڕانییەوە. چونکە " کەوتنی ئەمانە " کەوتنی فیکرو مەنهەجە " ناتەواوەکانیان "ە لەزۆربەی کات دا.. پەی بردنیش بە مەنهەجێکی پوختی فیکری ئیسلامیو هۆشمەندییو پابەندی (ئیلتیزام)یش پێوەی، یەکەم هەنگاوی زامنی بنەڕەتییە لەڕێگەی گۆڕانکارییدا بێ ئەوەی لەو دیو واقیع و لە پشت ناسینی واقیعەوە بین.. (واقیع) خۆیشی لەسەر بیرۆکەی گۆڕانکاری دامەزراوەو لە ئاست ڕووبەڕوو بونەوەی ئەو تەوژمە فیکرییەی چەند سەدەیەك لەمەوبەرەوە داڕێژراوە، لە پشت دەریاکانەوە هات و دیراسەی بست بەبستی خاك و- دێ بەدێی هەرێم- و شار بەشاری نیشتمان و یەك بەیەکی هۆزو تیرەو قەوم و گەلانی ئیسلامیمانی کردو، هەموو جۆرە داب و نەریت و بارودۆخێکی ڕۆژهەڵاتی دوورو نزیك و ناوەڕاستمانیان تاوو توێ کرد.. جا داخۆ کەی بێت ئێمەش وزەو توانای فیکریی لەسەرجەم کانگەو سەرچاوەکانییەوە گرد کەینەوەو تەوژمەکە بەدژە ئاڕاستەی خۆیدا پێچەوانە بکەینەوەو چرای خۆمان لەماڵ بەماڵی ئەواندا داگیرسێنینەوە.. بەڵام نەك بەنەریتی داگیرکاریی ئەوان غەزوی نیشتیمان و هەرێم و ناوچەکانیان بکەین.

ئەو تەوژمە فیکرییەی کە چەندەها ساڵە بەناوی (ڕۆژهەڵاتناسی)یەوە تیر بارانی ڕووبەندی قیەم و ئاکارمان دەکات، تا ئەمڕۆش هەر ڕۆژەی لایەکمان ئیفلیج دەکات هەر بەکودەتایەکی ناخی بەشەریی خۆمان دەتوانین بەرپەرچی بدەینەوەو، هەر بە سوڵتانی عەقیدەو بیروباوەڕیش دەتوانین بەرەنگاری ببینەوەو، هەریەکە لە پێشەوا وەهمییەکانیشی چ (لویس) و (تۆینبی) و (کریمۆن) بێت

یان- پاپاو- بیکۆن- و- جب- و گرۆنبۆم- و سەرکردە ڕەگەزپەرستەکانی تریان بەزێنینەوەو ئەو کەلەپوورە شێواوەشیان تا پشت کەلاوەی کنێسەکانیان توورِ دەین.. جا هەر لە گەرمەی ئازارەکانی بزاڤی نوێماندا ئەم لێکۆڵینەوەیەش وەك چەندین لێکۆڵینەوەی خامە ژانگرتووەکان لە دایك بووە..

❁❁❁

# ڕۆژهەڵاتناسیی چی‌یە ؟ !

ڕۆژهەڵاتناسیی تەوژمێکی فیکری‌یە لەو لێکۆڵینەوەو دیراسە هەمە چەشنانەدا ڕەنگی داوەتەوە، کە دەربارەی ڕۆژهەڵات و گەلانی موسڵمان نوسراون و تێیاندا ڕۆژئاواییەکان لە ئایین و زمان و ئەدەب و شارستانی‌یەت و کلتووری ڕۆژهەڵاتیان کۆڵیوەتەوە.

"ئەم تەوژمە ڕۆڵێکی گەورەی لە صیاغەی دیدو تێڕوانینی غەربی‌یەکاندا لەسەر جیهانی ئیسلامی هەبووەو گوزارشتی لە پاشینەی فیکری‌ی ململانێ‌ی شارستانێتی‌ی نێوانیشیان دەکات"[١].

(ڕۆژهەڵاتناسیی) بە عەرەبی (استشراق) و بە فارسی (خاورشناسی) و بە فەرەنسی (ORIENTALISME)ی پێ دەگوترێت.. (واتە: ئەو دیسپلینانەی کە ئامانجیان لێکۆڵینەوەی شارستانی‌یەتەکانی ڕۆژهەڵاتە)[٢].

" لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا بۆ یەکەم جار نووسەرە عەرەبە لوبنانی‌یەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لە جیاتی زاراوەی (ORIENTALISME) بەکاریان هێنا بۆ دیاری کردنی ئەو زانستەی، کە نووسەرە ڕۆژئاواییەکان لە ئاکامی گەشتەکانی خۆیان- بەرەو ڕۆژهەڵات- خۆیان پێوە خەریك کردبوو بۆ لێکۆڵینەوە لە میللەتانی ڕۆژهەڵات "[٣].

ڕۆژهەڵاتناسیی لە هەموو قۆناغێکدا بە سیمای سەردەم و مۆرکی سرووشتی‌دا دەناسرێتەوە، دەشێت لەهەمان کاتدا بە سیاسەتێکی (تەغریبی)یش دابنرێت. دیارە ماوەیەکی زۆر بوو کە بەیداخی ڕۆژهەڵات لەسەر بەشێکی گەورەی خاك و وڵاتانی ڕۆژئاوا دەشەکایەوە، چەند بنکەیەکی کاریگەریشی لێ

دامەزرابوو، چەند شوێنەوارێکی فیکریو کۆمەڵایەتیی گرنگیشی لە هزری ڕۆژئاواییەکاندا نەخشاندبوو، جگە لەو بیروباوەڕو عەقیدەیەش، کە وەك زەنگی سپێدەیەکی ئایندە هەردەم سەدای تایبەتی هەیە، چونکە ووشەی (ڕۆژهەڵات) لای ئەوان بە زەنگێکی تایبەتیو چەند چەمك و دەلالەتێکی وردو فرە ڕەهەندی جیاواز دادەنرێت. هەربۆیەش ئاستەکانی (پەسەندکردن) و (ڕەت کردنەوە) لەلای ئەوان بەڕەنگی ئەو هێماو دەلالەتانە دەناسرایەوە، کە لە دیدگای- ڕۆژئاواییەکان خۆیانەوە- سەیریان دەکردو، لە ئاوێنەی خەیاڵ و ئەندێشەیاندا عەقیدەی ڕۆژهەڵاتیان بەدیوەزمەیەکی سینەی پڕ لە هەواو ئارەزووەکانیان دەبینی..

تەنانەت خودی ڕۆژهەڵات و شارستانێتییە بێ وێنەکەیان بە مەڵبەندی ڕکەبەرایەتیو توندو تیژی دادەنا.. بەڵام لە ناخی دڵو بیرو هۆشیانەوەو بە قەناعەتیشەوە دەیانزانی کە "پەیامێکی ئاسمانی" بە ڕۆژهەڵات گەیەنراوە، دەبێت گشت مرۆڤێکی سەر زەمین بیخوێنێتەوە. دیارە ئەوان نەك هەر ئامادەی خوێندنەوەی ئەم پەیامە نەبوون، بەڵکو لەو ڕۆژەوەی کە ئەم ڕێچکەو تەوژمە ڕۆژهەڵاتییە بەدنیا ناسێنراوە لە هەوڵی بەردەوامی دابڕینی باڵادەستیی ڕۆژهەڵاتدا بوون، ڕۆژئاوا ویستوویەتی ئەدرێسی چەند ڕووپەڕێکی سەردەمی بەناو (ڕۆشنگەریی- تنویر)و کودەتای پیشەسازییو قودرەتە تەکنەلۆژیەکانیشی لە ڕۆژهەڵاتدا بنووسێتەوە، ئەمەش بەو پێو دانگە پووچەڵەی گوایە ڕۆژهەڵاتیش وەك ڕۆژئاوا شێوێنراوەکەیان پڕبووە لە (دادگاکانی پشکنینی بیروباوەڕی خەڵکی)و (دووکانەکانی فرۆشتنی پسووڵەی لێخۆشبوونی خودا)و لە (چەند کانتۆنێکی ژێر دەسەڵاتی حوکمی "ئیکلیری")..

ئەوان بە میکانیزمێکی ماددی ئەبستراکتی دەیانویست "فاکتەری دینی" لەسەر کەناڵی هۆیە هاندەرەکانیان بسڕنەوەو پێچەوانەی شاڵاوی باب و باپیرە خاچپەرستەکانیان ببزوێن، لە کاتێکدا تەنها ئەو تەوژمی خاچپەرستییەش یەکەم

پاڵنەری بنەڕەتییان بوو لە غەزوێکی تری ڕۆژهەڵاتدا.. بەڵام بەدەمامك و بەرگێکی زانستیانەی بەناو زانستیی (ڕۆژهەڵاتناسیی)یەوە[٤].

مامۆستا (فتحی محمد علی) دەڵێت: (.. مەبەست لە (ڕۆژهەڵاتناسیی).. سەرەتا گەڕان بەدوای ڕەگەزە شارراوەکانی شارستانییەت بووە لە ڕۆژهەڵاتدا.. هەروەها بۆ گەیشتن بەچەند ئەنجامێك و زانینی چەند "وقائع"ێك بووە بە هەندێك بەڵگەی مێژوویییەوەو، پاشان خستنە ڕووی دوایین ڕاستی لە بەردەم کەسانی بایەخ دەرو پەیوەندیداری وەك دەسەڵاتداران و داگیرکەران) [٥]..

بەمانای ئەم پرۆسەی (ڕۆژهەڵاتناسینە) وەك قۆناغێکی ڕێ خۆشکاریی بووە بۆ مەبەستە سەربازییەکان و بەڕێ خستنی سوپاکانیان بەرەو ڕۆژهەڵات، هەروەك لە دواییشدا ئەو نیازەیان بەدی هێناو بەکردەیی چەندین ناوچەی فراوانی ڕۆژهەڵاتیان داگیر کرد.. بۆ نموونە: ماوەی نێوان (ناوەڕاستی سەدەی هەژدە)و دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی)یش بەترسناکترین قۆناغی پراکتیزەکردنی فیکری- ڕۆژهەڵاتناسیی- دادەنرێت.. لەم ماوە زەمەنییەو (تەنانەت پێش ئەو ماوەیەش) بەردەوام بوون لە شێواندنی ڕوخساری ئیسلام و موسڵمانان لەناوەندە ڕۆژئاواییو ئەوروپییەکاندا، تا بە تەواوەتی ڕۆڵی خزمەتکردنی سیاسەتە کۆلۆنیالیستییەکانیان بگێڕن، ئەمەش دوای داگیرکردنی خاکی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی چەندین درۆو تۆمەت لەسەر گەلانی موسڵمان و شێواندنی فیکری ئیسلامی.. ئیدی تاغوتە ملهوڕو تەماعکارەکان لە هەموو گۆشەو کەنارێکی ئەو سەری دنیاوە هاریکاری یەکتر بکەن بۆ برەودان بە ستەم و چەوساندنەوەو دەست درێژیی..

❋❋❋ ❋❋❋

# مێژووی ڕۆژهەڵاتناسیی و دارشتنەوەی زاراوەکان

وێڕای ئەوەی سیاسەتی چاوبڕینە ڕۆژهەڵات و نیازە داگیرکاریەکان لەدێر زەمانەوەو لەسەدەکانی ناوەڕاست و پێشتریشەوە پیادە کرابن، بەڵام خودی- زاراوەی ڕۆژهەڵاتناسیی- بۆ یەکەم جار لە ساڵی "١٧٦٩ز" لە قاموسی ئینگلیزیی (ئۆکسفۆرد)دا دەرکەوتووە. پاشان لە ساڵی (١٨٣٨ز) لە قاموسی- ئەکادیمیای فەرەنسی- دا بەکارهێنراوە [٦].

زاراوەی ڕۆژهەڵاتناسیی بە هەر لقێکی ئەو زانستە دادەنرا کە بایەخی بەڕۆژهەڵات دەداو دیراسەی گەل و هۆزەکانی لە هەموو ڕویەکی ژیانیانەوە دەکرد، چ لەڕووی ئاینە ڕۆژهەڵاتیەکانەوە یان لەڕووی زمان و ئەدەب و هونەرو زانستەکانی تریانەوە بوو بێت.

مەبەست لە زاراوەی "جیهانی ڕۆژهەڵات"یش (بەپێی خشتەو پۆلێنکاریی ئەوروپییەکان) هەموو ئەو گەل و نەتەوانەیە کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئەوروپاوەو بەپێی تیۆرە ئەوروپییەکەش بەسێ بەش دانراوە وەك: (ڕۆژهەڵاتی نزیك، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ڕۆژهەڵاتی دوور) [٧]..

ئەوەی لێرەدا جێی سەرنج و لێوردبوونەوە بێت ئەوەیە کە ئەم زاراوەیە بەپێی تیۆرە ئەوروپاییەکە هەموو ئاینێکی جیهانی ڕۆژهەڵات و ڕێو ڕەسم و داب و نەریتەکانی شوێنکەوتوانیانی بەیەك چاو سەیر کردووەو لەزۆر شوێندا جیاوازیی نێوان عەقیدەی ئیسلامیو ئاینێکی شێواوی وەك (بووزایی) نەکردووە. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە کە دژی ئیسلام و شارستانییەتەکەی

کـراوە.. هـەروەها ئەگـەر لـە دەلاقەیـەکی فـراوانی مـێژوویی‌یەوە بـڕوانین بـۆ سیاسـەتی چـاوبڕینە ڕۆژهـەڵات و تـێکدانی ناوچـەکانی‌و پێشـینەیەکی تـری بـۆ وەبەرنـێین، ئـەوا چـەندین قۆنـاغ و سـەردەمیش لە چەند وێستگەیەکی جیاجیادا دیاریی دەکەین..

# قۆناغەکانی چاوتێبڕین لە ڕۆژهەڵات

بێگومان خودی پرۆسەی ڕۆژهەڵاتناسیی، دەرەنجامێکی حەتمیی ململانێی نێوان (ڕۆژهەڵاتی ئیسلامخواز) و (ڕۆژئاوای- نەسرانی) بووە، هەر لە ڕۆژگاری خاچپەرستەکان و نیازە شەڕخوازییە عەسکەرتاریەکانیانەوە، تا ڕۆژگاری پەیوەندییە دیپلۆماسیەکان و دامەزراندنی باڵوێزخانەکان و بەرنامە ڕێژیی سەفەرو گەشتیاریو ناردنی گەڕۆك و گەشتیارەکان.. هاندەری بنچینەیشیان بەگیانێکی (لاهوتی/نصرانی)یەوە بووە بەمەبەستی تێکشکاندنی ئیسلام لەناخەوە و، هۆنینەوەی چەند مەکروفێڵ و پیلانێك هەرچەندە لەم دواییانەدا پرۆسە ڕۆژهەڵاتناسییەکانیان بە سیمایەکی زانستیانە ئارایشت دابێت.

دەشێت سیاسەتی "ڕۆژهەڵاتناسیی"یش بەسێ قۆناغ دیاری بکەین:

## قۆناغی یەکەم: ناسینی شارستانیەتی ئیسلامی..

هەرچەندە کارێکی نەختێك گرانە، کە سەرەتایەك بۆ ڕۆژهەڵاتناسیی دیاری بکرێت، بەڵام هەندێك لە مێژوو نووسان دەیگێڕنەوە بۆ ڕۆژگاری دەوڵەتی "عەبباسی" لە- ئەندەلووس- هەندێکی تریشیان دەیگێڕنەوە بۆ سەردەمی خاچپەرستەکان و ڕۆژگاری (جەنگی خاچپەرستی)و بەزینیان لە بەرامبەر سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی (صلاح الدینی ئەییووبی).. لەم ڕووەوە بۆ قۆناغی یەکەم چەند نموونەیەك دێنینەوە:-

١- ڕۆژهەڵاتناسیی- لاهوتی [٨]. بەشێوەیەکی ڕەسمی لەساڵی (١٣١٢ز)دا

سەری هەڵداوە کاتێك لەو ڕۆژگارەدا ئەنجومەنی کەنیسەی (ڤیەننا) بڕیارێکی دەرکرد لەمەڕ خوێندنی چەند کتێبێکی عەرەبی لە قوتابخانەکانی ئەورووپادا. بەپێی ئەم بڕیارە لە زانکۆ سەرەکی‌یەکانی (ئۆکسفۆرد، پۆلۆنیا، پاریس، کامبریج، سلامنکا) دەستیان کرد بەدەرس دانەوەی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان بە تایبەتیش عەرەبی [9]. واتە لە ڕێی ئەو قوتابخانانەو لێکۆلینەوەی کتێبە ئیسلامی‌یەکانەوە، کە بە (زمانی عەرەبی) نووسرا بوون جۆرە دیاردەیەکی ڕۆژهەڵاتناسیی لەو سەردەمەوە دەرکەوتووە ئەگەرچی واش ناودێر نەکرابێت.. بەڵکو زانستێکی تازەیان لەبارەی زمان و ئەدەب و فیکری ڕۆژهەڵات بوە. لە سەدەی سیازدەی زاینیشدا ئەو نیازە لە جەنگە خاچپەرستیەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، هەر لەو سەردەمەدا هەڵمەتی موژدەگاری (تبشیر) واتە بە مەسیحی کردنی خەڵکیو سەپاندنی حوکمی پاپاکان و دادگا ناهەموارەکانی پشکنینیان برەوی پێدراوە.. دادگاکانی (پشکنینی بیروباوەڕی خەڵکیو ڕەوتی ژیان و بیرکردنەوەیان) و (ڕێگرتن لە داهێنانە زانستی‌یەکان) تا ساڵی (١٧٩٢ز) لە ئیسپانیادا بەردەوام بووەو لەدوای ئەو ساڵەوە (ناپلیۆن پۆناپارت) هەڵی وەشاندۆتەوە [10]..

٢- یەکێك لەو ڕاهیبە (بەندەکتی)یانەی ڕوویان لە- ئەندەلووس- کردووە (جیربێرت دی ئۆرلیاك) بووە (٩٣٨- ١٠٠٣ز) کە لەلای مامۆستایانی (ئەندەلووس) خوێندویەتی، دوای ئەوەی بۆ- فەرەنسە- گەڕاوەتەوە بە (زانای مەزن) یان (پاپا) هەڵبژێرراوەو ناوی (سیلڤستەری دووەم)یان لێ ناوە، بەیەکەم پاپای فەرەنسی دانراوەو ئیدی لە ساڵی (٩٩٩ز) تا دوایی ژیانی واتە ساڵی ( ١٠٠٣ز) لەو پلەیەدا بووە [11]..

٣- ساڵی (١١٣٠ز) سەرەك قەشەکانی (طوـــلە یطوـــلە) چەند کتێبێکی زانستی ئیسلامییان تەرجەمە کردووە[١٢]..

٤- زانای ئیتالی (جیراردی کریمۆن) لە (١١٤- ١١٨٧ز) چەندین ساڵی ژیانی تەرخان کردووە بۆ مانەوەی لە شاری (طولە یطولە)داو نزیکەی (٨٧) کتێبی ئیسلامیی تەرجەمە کردووە، کە دەربارەی فەلسەفەو نوشداریی‌و گەردوونناسی‌و غەیبزانی‌و لێکۆڵینەوەی نادیارەکان بوون[١٣]..

٥- (پوتروس)ی ڕێزلێ نراو (١٠٩٤- ١١٥٦ز) ڕاهیبێکی فەرەنسی بەندیکتی بووەو سەرۆکی- دێر- ی- کلوونی- بووەو تاقمێکی لە وەرگێڕەکان (تەرجەمەکاران)ی کتێب پێك هێناوە، تاکو مەعریفەیەکی بابەتیانەی لەسەر ئیسلام دەسکەوێت. هەر خۆیشی خاوەنی بیرۆکەی تەرجەمەی ماناکانی قورئانی پیرۆز بووە بۆ سەر زمانی لاتینی لە ساڵی (١١٤٣ ز)دا کە (ڕۆبەرت ئوف کیتۆن)ی هاوڕێی ئینگلیزي بەو کارە ڕاسپارد بوو، ئەویش بۆی تەرجەمە کردبوو[١٤]..

٦- (یۆحەننای ئیشبیلیەیی)، کە یەکەم جار جوولەکە بووەو دوایش بووە بە- نەسرانی- و لە ناوەڕاستی سەدەی دوازدەدا بایەخی بەزانستی " ئەستێرەناسی " داوەو چوار کتێبی (ابو معشر البلخی) لە ساڵی (١١٣٣ز)دا بە هاوکاریی (ئەدلەر ئۆف پاس) تەرجەمە کردووە[١٥].

٧- (ڕۆجەر بیکۆن)یش (١٢١٤- ١٢٩٤ز) کە ئینگلیز بووە لە (ئۆکسفۆرد‌و پاریس) خوێندویەتی‌و دکتۆراشی لە زانستی- لاهووت- دا هەبووە، کتێبی (ئاوێنەی کیمیا- مرآة الکیمیاء-)ی لە عەرەبییەوە تەرجەمە کردووە. ساڵی (١٥٢١ز) جارێکی تر لە- نۆرنبیرگ- ئەو کتێبە چاپ و

بڵاو کراوەتەوە. جگە لە چەندان کەسی تر کە لە ڕۆژئاواوە کتێبە ئیسلامی‌یەکانیان تەرجەمە کردووەو سوودیان لێ وەرگرتوون..

کەوابوو دەشێت قۆناغی یەکەمی (ڕۆژهەڵاتناسیی) بە قۆناغی ناسینی شارستانیەتی ئیسلامی دابنرێت.. چونکە لەم قۆناغەدا دەیان کەسیان بۆ زانکۆ ئیسلامی‌یەکانی "(طولە یطولە و قورطوبە) ناردووە تا چەندین کتێبی (فەرموودەو تەفسیر)و زانستە بەکەڵکە ئیسلامی‌یەکانی تر تەرجەمە بکەن.. جگە لەوەش کە دەرچووانی ئەم زانکۆیانە کاتێك بۆ وڵاتاتی خۆیان گەڕاونەتەوە، تەنها چەند کتێبێکیان لەسەر چۆنیەتی فێربوونی زمانی عەرەبی داناوە. هەندێکی تریشیان بە ویژدانەوە باسی ئیسلام و شارستانێتیەکەیان کردووە، کە لە بەشێکی تری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

## قۆناغی دووەم: شێواندنی ڕاستی‌یەکان..

ئەم قۆناغە بە قۆناغی شێواندنی و فیکرو بیروباوەڕو شارستانی‌یەتی ئیسلامی دادەنرێت، جگە لە دزینی چەندین تیۆری فیکریی ئینسانی لە موسڵمانان و دانانیان بە " فیکری یۆنانی "[١٦]. هەروەها بە ڕۆژئاوایی دانانی چەندین بنەمای شارستانی‌یەتی ئیسلامی و کردنیان بە چەند تیۆرێکی زانستیو فەلسەفی‌ی ڕۆژئاوایی بێ ئەوەی لە تەنها سەرچاوەیەکدا ئاماژە بۆ چەمکێکی ئیسلامی‌ی بکەن. ئەم قۆناغە لەماوەی نێوان سەردەمی کۆن و پێش سەردەمی نوێو شۆڕشی پیشەسازیی‌دا بوو. واتە لە سەرەتای ڕووخانی دەوڵەتی ئیسلامی لە (ئەندەلوس) لە ساڵی (١٤٥٢ز)دا.

بێگومان ئەورووپاش سەرەڕای ئەوەی لەو سەردەمەدا لە تاریکایی شەوە زەنگی جەهالەت و دواکەوتویی‌دا بوو، لە داڕووخانی ئەخلاقیو کۆمەڵایەتیشدا دەتلایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بێ شەرمانە هێرشیان دەکردە سەر

ئایینی پیرۆزی ئیسلام و سەر خودی پێغەمبەرەکەشی محمد (ﷺ).. تەنانەت گەر کەسێکیان موسڵمان ببوایە پێیان دەگووت (بووە بە مەسیحییەکی- محمدی). لەم قۆناغەدا بۆیە ڕق و کینەیان بەرانبەر ئیسلام دەرکەوتووە، چونکە ئایینی ئیسلامیان وەك کۆسپێکی گەورەی سەر ڕێگەی بانگەشەچیو هەڵسووڕاوەکانیان دەبینی، (واتە ئەوانەی لە سیاسەتی (تەبشیر)و بە مەسیحی کردندا کاریان دەکرد).. هەروەها ڕق و کینەی ڕەشیان بەرانبەر ئیسلام و کۆمەڵگەی موسڵمانان دیارترین ئاسەواری ڕێڕەوە فەرهەنگییەکانیان بووە. لە خۆرهەلاتیشدا ڕێڕەوی فیکریو مەنهەجی توێژینەوەکانیان هاوڕەوت و هاوسۆزی ڕێچکە مەتریالیو عەلمانییە هەمەڕەنگەکان بوو.. قوتابخانەکانی بیری (ڕۆژهەڵاتناسی)یشیان بەگشتی لە دوو جۆری وەك (سەرەکی و مام ناوەندیی)دا ناسراون.. جۆری یەکەمیان کە بەسەرەکی دانراوە، کاراییەکی سەربەخۆو دیاریی لەسەر لێکۆڵینەوەو توێژینەوە جیهانییەکان هەبووەو پەلی بۆ شیکاری چەند مەسەلەیەکیش ڕاکێشاوە. جۆری دووەمیش کە بەمامناوەندیی ناودێر کراوە تایبەت بووە بە سوود بینین لە چەند ماوەیەکی زەمەنیی دیاری کراو، تێیدا (قوتابخانەی فەرەنسی) بە نموونەی هەرە دیاری ڕۆژهەڵاتناسیو بە پێشەنگیشی دانراوە. چونکە هەمیشە بۆ دەربڕینی دژایەتیو ڕکەبەرایەتیی ئیسلام تەرخان کراوەو، پاشان گیانێکی ڕەگەزپەرستانەشی بەبەردا کراوە، چونکە ئەڵقەیەکی گەیاندن بووە بۆ جەنگە خاچپەرستییەکان و پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیشی بە بزاڤی ئیمپریالیزمەوە هەبووە.

سەرەتای دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە بۆ (سەدەی دوازدەی زایینی) دەگەڕێتەوەو لەسەر بیروڕای قەشەکانی- کلوونی- فەرەنسا) بووەو بە مەبەستی لێکۆڵینەوەو تەرجەمەو شیکاری فیکرو کلتووری موسڵمانان. هەر لەوێشەوە ئەم چالاکیو جموجوولانە بەرەو (ئیسپانیا) درێژ کراوەتەوە. پاشان قوتابخانەکە زیاتر پەرەی پێ درا، تاکو لە (کۆلیج دی فرانس) لە ساڵی (١٥٣٩ز)دا

بەشێکی- زمانی عەرەبی- بۆ کرایەوە. کاریگەریی ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ هێرشی ڕۆژئاوادا بۆ سەر بەشەکانی تری جیهان بەردەوام بوو، واتە لەگەڵ خۆگەیاندنی ئەوروپییەکان بە مەڵبەندی یەکەمی ئیسلام کە نیمچە دورگەی عەرەبی بوو. دوای ئەمەش داگیرکەرە فەرەنسییەکان گەیشتنە ئەفەریقاو ڕۆژئاوای ئاسیا. هەر لەم قۆناغەدا چەند کەسێکی موژدەگار (مبشر) و بڵاوکەرەوەی تەورات و ئینجلیش بۆ ئەو وڵاتانە نێرران، کە چەند کەمینە (اقلیة)یەکی جوولەکەو دیانیان تێدا دەژیا، بەڵام زیاتر بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیارییە سەرەتاییەکان و (دیراسەی مەیدانی)یش لەسەر موسڵمانان لە وڵاتانی خۆیاندا، تاکو مادەیەکی سەرەتاییو خاوی بەردەستی ڕۆژهەڵاتناسەکانیان بێت.

پاشان ڕۆژهەڵاتناسە (مژدەوانەکان) بۆ جیهانی ئیسلامی بنێررێن و لە پێش هەمووشیانەوە ڕۆژهەڵات ناسانی فەرەنسەیی شارەزایی لە پیشەکەیاندا بەدەست بێنن، بەو شێوەیەش نەخشەو پلان داڕێژن، کە خزمەتی ئامانجە کلتووریی‌و سیاسییەکانی ئیمپریالیزمی فەرەنسی بکات، ئینجا زەمینەی پەیوەست بوونی ڕۆحی‌و مەعنەویی بە فەرەنساوە بخولقێنرێت.. جگە لە بانگەوازێکی ساختە بۆ پێشخستنی ئیسلام.. بەڵام بەو شێوازەی کە هەموو ڕوخسارێکی بشێوێنرێت و دەرفەت بۆ- ڕۆژهەڵاتناسان- برەخسێتە تا بە ئارەزووی خۆیان بەنێو شارو وڵاتانی ئیسلامیدا بسووڕێنەوەو ڕێگەی شاڵاوی دڕندانەی سەربازیی بۆ خۆش بکەن.. بۆ ئەم مەبەستەش هەر پەنایان دەبردەبەر کەمە نەتەوەییەکانی " نەسرانی و یەهوودی وهاوشێوەکان"ی تریان کە دانیشتووی چەند ناوچەیەکی خاکی ئیسلام بوون، لەدێر زەمانەوە لە سایەی حوکمی ئیسلامدا وجودو قەوارەو ناسنامەی نەتەوەییان پارێزراو بوو.. بەڵام لەو جۆرە بارودۆخانەشدا بەکارهێنراون بۆ زانیارییە مەیدانییەکان وەك

سەرچاوەیەکی پشت پێ بەستراو [١٧]. ئیتر لە قۆناغێکی دواتردا ڕێگە خۆش کەن بۆ شاڵاوی سەربازیی‌و بەکارهێنانی لۆژیکی هێزو سەرکوت کردن.

## قۆنـــاغی ســێیەم: داگیرکــردنی ڕۆژهــەڵات و بەردەســت کــردن (تســـخیر)ی بۆ شارستانی‌یەتی ڕۆژئاوا..

دەشێت بڵـێین تـا ئەمـڕۆش ئـەم سیاسـەتە بەردەوامـە وێـڕای ئـەوەی چـەند وڵاتـێکی ڕۆژهـەڵات بەڕوالـەت سـەربەخۆبن، ئـەم قۆناغـە لـەدوای کودەتـای پیشەسازی‌یەوە دەستی پێکرد. چونکە لەو سەردەمەدا پێوەندیی نێوان هەردوو تەوژمی (ئیمپریالیزم) و (ڕۆژهەڵاتناسیی) بەهێز کرابوو، تەنانەت خودی تەوژمە ڕۆژهەڵاتناسـی‌یەکە بەڕێگەیـەکی مەنتیقی‌و زانستی دادەنـرا بـۆ داگیرکـردنی خـاکی موسـڵمانان لـە بەشـێکی دیـاریی ڕۆژهـەڵاتدا.. هـەر لـەو زەمانەشـدا ڕۆژهەڵاتناسـان بەگشتی بـوو بـوون بـە چەند فەرمانبەرێکی دەزگا هەواڵگریی‌و جاسوســی‌یەکانی ســەر بەهــەردوو وەزارەتــی (دەرەوە)و کۆلۆنـیالەکان (مستعمرات) و، وەك چەند ڕاوێژکـارێکی وڵاتەکانی خۆیان هەڵس و کەوتیان دەکرد، بەتایبەتیش لـەو کاروبارانەدا کە بە چەند هەڵوێستێکی سیاسی بەرانبەر دەوڵەتە ئیسلامی‌یەکان پەیوەست بـوون. تەنانـەت هـەندێك لـەو زانـاو بیریـارە ڕۆژهەڵاتناسـانەی دەیانویسـت وا خۆیـان بناسـێنن گوایـە بەرگـری لـە فـیکرو عەقیدەی ئیسلام دەکەن، یان گوایە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی‌ی لەسەر دەنووسن، کەچـی بـە پێچـەوانەوەو لەژێـر پـەردەی ئـەو ئـیدیعاو پـڕوپاگاندانەدا ڕۆڵـی سـیخوڕیی (جاسوسـی)یـان لـە دژی ئیسـلام و مەملەکەتەکـەی دەگـێڕا. هەندێکیشیان هەر لەژێر ئەو پەردەیەدا سەردانی حیجازو شارە پیرۆزەکانی (مەککە- مەدینە)یان دەکرد [١٨].. یەکێك لەوانەش ڕۆژهەڵاتناسی هۆڵەندی (شروود) بوو، کە بە پۆشاکی ئیسلامخوازیەوە خۆی پیشانی خەڵکی دەداو لە

سەدەی نۆزدەدا سەردانی (مەککە و مەدینە)ی کرد. بەڵام سیخوڕێك بوو لەدژی دەوڵەتی عوسمانی کاری دەکرد.(١٩)

لە قۆناغی سێیەمدا تەواو ئاشکرایە چۆن- ڕۆژهەڵاتناسی- ڕێگەی بۆ ئیمپریالیزم خۆش کردو، تاکو ئەم ڕۆژگارەش لە نەخشەڕێژی سیاسەت و وێناکردنی هەڵوێستەکانیدا، پاڵپشتێکی گەورەی بوو بۆ نموونە: سەرەك وەزیرانی ئەو سەردەمەی بەریتانیا (میستەر- ئایدن) هیچ بڕیارێکی سیاسیی دەربارەی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) دەرنەدەکرد، هەتا چەند مامۆستایەکی زانکۆی (ئۆکسفۆرد)ی نەدیبا لەوانەی، کە لەوەو پێش وەك ڕۆژهەڵاتناس کاریان کردبوو، دووایش لە کۆلێجی (زانستە ڕۆژهەڵاتییەکانیئەو زانکۆیە) دەرسیان دەگوتەوە. دیارە هەر (ئایدن)یش ئەو جۆرە شێوازەی بڕیاردانی نەبوو، بەڵکو زۆربەی سیاسەتمەدارو گەورە دەسەڵاتدارەکانی ئەورووپاو ئەمەریکاو ڕووسیاش، هەمان ڕێو شوێنیان دەگرتە بەر(٢٠).

بێگومانی کودەتای پیشەسازیو شۆڕشی فەرەنسی بۆ داگیرکردنی ڕۆژهەڵات، ڕێگەیەکی تری بۆ ئاسان کردوون و زیاتر لەم بڕگەیەی داهاتووی باسەکەماندا تیشکی دەخەینە سەر.

# ڕۆژهەڵاتناسیی و "ئیمپریالیزم"

ناپلیۆن لە ساڵی ۱۷۹۸زدا هەوڵی داگیرکردنی میسری‌دا، (کانیفا)ش هێرشی کردە سەر (لیبیا). لە هەردوو حاڵەتی دەستدرێژی‌یەکەدا فیکری- ڕۆژهەڵاتناسیی ڕۆڵێکی تەواوی هەبوو لە شاڵاوی دڕندانەی داگیرکەراندا بۆ سەر خاکی ئیسلام، ئەوەبوو هەریەکە لە (ناپلیۆن) و (کانیفا) چەند بەیاننامەیەکیان بەزمانی عەرەبی بڵاوکردەوەو وایان ڕاگەیاند گوایە ئەوان هاتوون بۆسەرخستنی ئیسلام و پاراستنی موسڵمانان لە ستەمی (مەمالیك)و (عوسمانی)یەکان. تەنانەت (ناپلیۆن) لە وتارێکی‌دا بۆ میسری‌یەکان وا خۆی لەقەڵەم دابوو، کە وەك ئیماندارێکی ڕاستەقینەیەو ئەو (پاپا)یەشی لەنێو بردوە کە مەسیحی‌یەکانی لەدژی موسڵمانان هاندەدا [۲۱].. نوسەرێکی وەك (ریچارد بێرتن) چەندین ڕۆژهەڵاتناسیی وەك: (جرترو دبیل، ڕۆناڵد ستۆرز، سانت جۆن فیڵبی، ولیەم کیفۆرد بالکریف) بە چەند بەکرێ گیراوێکی ئیمپریالیزم دادەنێت [۲۲]. بەڵام خودی (بیرتن)یش لە زۆربەی گەشت و دیراسەو نوسینەکانی‌دا خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بە ئەوروپی‌یەکان کردووە.

(ئیدوارد سعید) لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا (الاستشراق) دەڵێت: (بەشێکی زۆری نیازە تەماعکاریەکانی فەرەنسا لە سێیەکی دوایی‌ی سەدەی نۆزدەدا، لەو ئارەزووە دیارەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە قەرەبووی سەرکەوتنی (بروسی) لە ساڵانی (۱۸۷۰- ۱۸۷۱) بکاتەوەو بگاتە ئاستی توانا سەربازی‌یەکانی بەریتانیا. ئەمەش لەو نیازە دێرین و درێژخایەنەی پێشبڕکێ‌ی زووی (ئەنگلۆ- فەرەنسی)یەوە بۆیان مابووەوە، تاکو فەرنسی‌یەکان نمایشی تارمایی‌یەکی بەریتانی بکەن، چونکە سووربون لەسەر ئەوەی، کە لەهەر بووارو

لایەنێکی پەیوەست بە (شارەزاییەوە لەسەر ڕۆژهەڵات) بگەنە ئاستی ئینگلیزەکان [٢٣].

دیارە هەر تەنیا فەرەنساو بەریتانیاش بایەخیان بە چالاکییە ڕۆژهەڵاتناسییەکان نەداوە، بەڵکو چەندین دەوڵەتی تری ئەوروپا بەپلەی جیاوازو بەگوێرەی بەرژەوەندییە نادروستە کۆلۆنیالیستییەکانیان بایەخیان بەم بوارە داوە. هەڵبەتە وڵاتانی ڕۆژئاوا بە پلەی یەکەم لە کاتێکی زوترەوە دەستیان پێکردووە. بەڵام- ئەڵمانیا- هێندەی فەرەنسا یان ئیتالیا بایەخی بە لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان نەداوە. لەدوا قۆناغیشدا هەموو وڵاتە ئەوروپییەکان بەشداریی مەیدانی ڕۆژهەڵاتناسیی بوون و مونافەسەی یەکتریان تیادا کردووە. ئەمەش نەك بۆ سەرخستن و بەجێ گەیاندنی هەقێك، بەڵکو بۆ پەیداکردنی زۆرترین دەسکەوت لە ڕۆژهەڵاتەوە. هەر لە قۆناغی سێیەمیشدا (ڕۆژهەڵاتناسیی ئەمەریکا) دەرکەوتووە ئەگەر چی هەر درێژبوونەوەیەکی ڕۆژهەڵاتناسیی بەریتانیاو فەرنسا بووە، بەڵام بەرەو ڕەوتێکی داگیرکاریی هەنگاوی ناوەو لەم ڕووەشەوە پێشبڕکێی لەگەڵ ئەوروپییەکاندا کردووە.

ئەمریکا هەرچەندە لە سەدەی بیستەمدا بەشێوەیەکی زیاتر توانی نیازە ڕۆژهەڵاتناسییەکانی بەدی بێنێت ، بەڵام لە یەکەمین کۆبونەوەی ساڵانەی (کۆمیسۆنی ئەمەریکی تایبەت بە ڕۆژهەڵات) لە ساڵی (١٨٤٣ز)دا سەرۆکی کۆمیسۆنەکە ئاماژەی بۆ (زەرورەتی چالاکی ڕۆژهەڵاتناسیی ئەمەریکا) کردووەو، داوای پەیڕەوکردنی تیۆری ڕۆژهەڵاتناسینی کردووە. هەروەها لە ڕاپۆرتێکی تایبەت بە چالاکیی ڕۆژهەڵاتناسیی ئەمەریکیدا هاتووە، کە ئەم سیاسەتە (واتە ڕۆژهەڵاتناسیی) بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی (ئەمنی قەومی) [٢٤]. کارێکی یەکجار پێویستە. لە لایەکی ترەوە، سەرباری ئەوەی (ئەورووپاو ئەمەریکا) بە گشتی بەشی (شێر)- حصە الاسد- یان لە پیادەکردنی ئەو

سیاسەتەدا بەرکەوتبێت، بەڵام جۆرێك لە (ڕۆژهەڵاتناسي)ی دەوڵەتە گەورەکانی ڕۆژهەڵاتیش لە قۆناغی سێیەمدا دەرکەوتبوو، وەك (ڕووسیا) کە هەمان تەوژم و تیۆری لە چەند ئامانجێکی ستراتیژیدا تەبەنني کردبوو. چونکە (ڕۆژهەڵاتناسي)ی ڕووسی ڕۆڵێکی نالەباری گێڕاوە لە یارمەتی دانی جوولەکەو بزاڤی زایۆنیستیدا، تا وردە وردە خۆیان بخزێننە نێو خاکی فەلەستینەوەو دەوڵەتێکی یەهودیی لەناو جەرگەی جیهانی ئیسلامیو نیشتمانی عەرەبدا دامەزرێنن. ئەوە بوو لە ساڵی (١٨٥٢ز)دا حکومەتی (قەیسەری ڕووسی) لیژنەیەکی لە (ڕۆژهەڵاتناسان و لە پسپۆڕانی کاروباری عەرەبیو ئیسلامی) پێك هێنا، کە لە نێویاندا چەندین ڕەگەز پەرستی جوولەکەی تێدا بوو ویەکەم نیازی ئەو لیژنەیەش دابین کردنی چەند کەرەسەو پێداویستیەك بوو بە مەبەستی بونیادنانی چەند خانوویەك بۆ ئەو جولەکانەی، کە لە (ڕووسیا)وە بۆ فەلەستین کۆچیان کردبوو، جگە لە کردنەوەی چەندین نەخۆشخانە بۆ نەخۆشەکانیان و لەژێر سەرپەرشتی ئەو (نێردە دیبلۆماسییە)ی، کە لەشاری (قودس)دا مەڵبەندی چالاکیان کردبووەوە بەبیانوی سەرپەرشتی کردنی کێشەی خۆیان و کێشەکانی ئەو مەسیحیانەی کە لەسەر مەزهەبی خۆیان (واتە ئەرسەدۆکسی ڕووسی) بوون. لە ساڵی (١٨٣٤ز)یشدا ڕووسیا وەفدێکی لە ئەندامانی ئەو دەستەیە بەنهێنی نارد بۆ (فەلەستین)، تاکو ئامێرو شت ومەکی تەواو لەکاری بنیات نانی پەناگەو بنکەی تەندروستیو شوێنی حەوانەوەی ئەو جولەکانەی لە سەرانسەری دنیاوە دەهاتن بۆ سەردانی (مبکی)ی بیت المقدس دابین بکەن. ساڵی (١٨٨٢ز)یش ئەم لیژنەیە بووە بە کۆمەڵە (جمعیە)یەکی سەربەخۆ. جێی باسیشە لە ساڵی ١٩٧٢ز ئەم کۆمەڵەیە بەبۆنەی تێپەڕبوونی نەوەد ساڵ بەسەر دامەزراندنیدا، ئاهەنگێکی لە پەیمانگای لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسیی لە (مۆسکۆ) گێڕا، کە سەر بەر ئەکادیمیای زانستەکانەو ئاهەنگەکەش لە ڕۆژی (١ی/مانگی مایسی) ئەو ساڵەدابوو کە تیایدا

ڕۆژهەڵاتناسیی ڕووسی (س. ل تیخیفنسکی) وتەی سەرۆکی کۆمەڵەی خوێندەوەو تیایدا ووتی: (بێگومان کۆمەڵەی (ڕۆژهەڵاتناسیی- ڕووسی بەشداریەکی کاریگەری هەبووە لە هێنانە کایەو دروست کردنی نیشتمانێکی نەتەوەیی یەهوودی لە فەلەستیندا) [٢٥]. پاشان ڕاپۆرتێکی درێژی لەسەر کارو چالاکی‌و دەست کەوتەکانی نەوەد ساڵی ڕابوردوی کۆمەڵەکەیان بۆ ئامادەبوان خوێندەوە.

جا هەرچەندە ئەمڕۆ بگوترێت کەوا ئیمپریالیزم لە ئارادا نەماوەو سیاسەتی ئیمپریالی‌و ڕۆژهەڵاتناسی‌یەکەش چەند سیمایەکی تریان پێ درابێت و خرابنەسەر ڕێڕەوی مەعریفەیەکی ئارایشت کراو و، پاشان چەند بەخششێکی (مرۆیی)و مرۆڤ دۆستانەیان پێوە لکێنرابێت، بەڵام هەرگیز ئەو ڕاستی‌یە تاڵ و حەشا هەڵنەگرانە لەبیر ناکرێن و نابێت ئەو لایەنە زەقە فەرامۆش بکرێت، کە ڕۆژهەڵاتناسان و تەوژمە ڕۆژهەڵاتناسی‌یەکان چ ڕۆڵێکی سلبی و نالەباریان هەبووە لەڕێ خۆشکردندا بۆ داگیرکەران.. بە تایبەتیش کە چەندین ڕۆژهەڵاتناسیان کارگێڕو کارمەندی چالاکی دەزگاکانی موخابەراتی ڕۆژئاوا بوون.. وەك (ئیدوارد سەعید)یش دەڵێت: (بێگومان بەڕاشکاوی دەڵێین، کە (ڕۆژهەڵاتناسیی وەك کردارو وەك مەعریفەیەکی دیار، هاندەری ئەوروپا یان ڕۆژئاوابوو بۆ داگیرکردن و دەست بەسەراگرتنی بەشێکی زۆری خاکی ڕۆژهەڵات، چونکە قۆناغی ئەو پێشکەوتنە گەورەیە لە دەزگاکانی ڕۆژهەڵاتناسیی‌دا هاوزەمانی ئەو پەلهاویشتنە فراوانە بێ نمونەیەی ئەوروپا بوو. بۆ نموونە تەنها لە ساڵی (١٨١٥ز تا ١٩١٤ز) ڕکێفی کۆلۆنیالیستی ڕاستەوخۆی ئەوروپا لە ڕێژەی ٣٥٪وە گەیشتە نزیکەی ٨٥٪ی خاکی ڕۆژهەڵات. ئەم پەلهاویشتنە فراوانە تەماعکاریەش هەردوو کەرت (قاڕە)ی ئاسیاو ئەفریقیای گرتەوە [٢٦].. کەوابوو لە پشت (ڕۆژهەڵاتناسی)یەوە نیازە کۆلۆنیالیستی‌و

سیاسیو عەسکەرتارییەکان، نەك توێژینەوەی زانستیانەو خزمەتی ئامانجە
مرۆیی یەکان حەشار دراون. هەر بۆیەش دوای گەشت و گەڕان و
توێژینەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان قۆناغێکی ئاشکرای هێرشی سەربازیی بۆ
داگیرکردنی خاکی موسڵمانان لە ڕۆژهەڵاتدا دەست پێ دەکات. پەیوەندیەکی
بەتینیش لە نێوان (سیاسەت و تەوژمی ڕۆژهەڵاتناسیی)دا هەبووە (ئیدوارد
سعید)یش لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (الاستشراق) باسی ئەو پەیوەندیانەی
کردوە، کە گەورەترین گریمان بۆ بەکارهێنانی فیکرە دەرهاوێژراوەکانی تایبەت
ە ڕۆژهەڵات بەنیازە سیاسییەکانەوە بەند بووە.. ئەمەش بەڕای (ئیدوارد
عید) زۆر گرنگ و حەساسە، هەروەك لە لاپەڕە ١٢١ی کتێبەکەیدا ئاماژەی
کردوە. لێرەشدا بۆ نمونە ئاماژە بۆ هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەکەین کە
ۆڵینەوەکانیان خستۆتە خزمەتی نیازە ئیمپریالیو داگیرکاریەکانەوە وەك (٢٧

- (کارل هینریش بیکەر) کە دامەزرێنەری گۆڤاری ئەڵمانی (ئیسلام)
و چەندین دیراسەو لێکۆڵینەوەی بە مەبەستی بەدی هێنانی نیازە
لیەکان لە ئەفریقادا تیادا نوسراوە.
(بارتۆڵد) ئەویش دامەزرێنەری گۆڤارێك بوو بۆ ئەو مەبەستەو هەر
(ئیسلام)و بە زمانی ڕووسیش بڵاوکراوەتەوە و، چەند بابەتێکی بۆ
گەیاندن بە بەرژەوەندییەکانی ڕووسیا لە ناوچەی ئاسیای ناوەڕاستدا

لندی کە لە ساڵی (١٨٨٢ز) بەناوێکی
وە بۆ مەککەو تەنها شەش مانگیش ماوەتەوە،
ی بۆ ئیمپریالیستەکان لەسەر (ڕۆژهەڵاتی
ەو بەریش (١٧) ساڵ لە (جاوە) ژیاوە.

٤- پەیمانگەی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان لە پاریس و کاری سەرجەم ڕۆژهەڵاتناسەکانی، کە ساڵی (١٨٨٥ز) دایان مەزراندووە پەیداکردن و گردکردنەوەی چەندین زانیاریی لە سەر وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ناوچەی (ڕۆژهەڵاتی نزیك) بووە، تاکو زەمینە بۆ سوپاکانیان خۆش کەن. وەك (د. فەرهاد پیربال)یش دەڵێت (داگیرکردنی میسر لەلایەن ناپلیۆن پۆناپارت لە ساڵی (١٧٩٨ز-١٨٠١ز)و پاشان داگیرکردنی جەزائیر لە سەردەمی (لویس فیلیپ)دا لە ساڵانی (١٨٣٠- ١٨٤٨)، ئەم دوو ڕوداوە پێویستیی دەوڵەتی فەرەنسای بە وەرگێڕو زمانزانان و ڕۆژهەڵاتناسان زیاتر کردووە، هەروەها هان دەوڵەتی فەرنسای‌دا کە بیر لە داگیرکردنی وڵاتانی وەك دەوڵەتی عوسمانی ئێرانیش بکاتەوە)[٢٨].

٥- (پییێر ئامێدی ژووبێرت)- (١٧٧٩- ١٨٤٧) دیبلۆماتێکی ناودا فەرەنسییەو کوڕە پارێزەرێکی ناودارو، قوتابی قوتابخانەی زما ڕۆژهەڵاتیەکان لە پاریس و، موتەرجیمی ناپلیۆن بوو لە کاتی داگیرک میسر لە ساڵی (١٨٠٤)دا، (ناپلیۆن) بە وەفدێك دەینێرێت بۆلای شای ئ [٢٩].

٦- (فاردینبێرگ) نەیدەتوانی نکوڵی لە ڕۆڵی چەواشەک ڕۆژهەڵاتناسان و پەیوەست بوونیان بەڕێنمایی داگیرکەرانەوە بکات. ١٨٧٣)ش لە یەکەمین کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناساندا توێژەرەوەکان هە پێویستی ناسینی یەکتر دەکرد. (سنۆك)یش ڕاستەوخۆ لە دوای دیرا ئیسلام و توێژینەوەکانی ئەو بوارە دەبێتە ڕاوێژکاری حکومەتی هۆ کاروباری ئیداری کۆلۆنیال (مستعمرە)ی موسڵمان نشینەکانی (ئینل [٣٠].

٧- (ماکدۆنالد و ماسینیۆن)یش لەسەر ئاستێکی باڵا لەلایەن ئیداره
داگیرکاری‌یەکانەوە ڕاوێژیان لەگەڵدا دەکراو بەو پێوادانگەی دوو پسپۆڕو
شارەزای بارودۆخی جیهانی ئیسلامیین لە (باکوری ئەفەریقا)وە تاکو
(پاکستان)، هەروەك (فاردنبیرگ)یش دەڵێت: (بەڵام بەکورتەیەکی زیادە
ڕۆیی‌یەوە ئەو پێنج توێژەرەوەیە لە کاتێکی دیاری کراودا دیدو بۆچونێکی
ڕەهایان لە سەر ئیسلام داڕشتووە، کە کاریگەریەکی فراوانی لەسەر هەموو
وەندە حکومی‌یەکانی جیهانی ڕۆژئاوا هەبووە) (٣١).

پێوەندیی "ڕۆژهەڵاتناسیی" بە "ئیمپریالیزم"ەوە، ئاتاجی بە چەندین
ۆڵینەوە هەیە، هەر لەسەردەمی پێش هێرشەکانی (ناپلیۆن) و(کانیفا) و
یەکانەوە، تا سەردەمی دوای جەنگە جیهانی‌یەکانی سەدەی بیست. ئەوە
فیکری (ڕۆژهەڵاتناسیی) لە هەردوو هەڵمەتەکەی بەریتانیاو فەرەنسادا بۆ
وڵاتانی عەرەبی و کوردستان وباکوری ئەفریقاو ڕۆژئاوای ئاسیاش
کی دیاری هەبوو لەو هەنگاوە ئیعلامیانەدا، کە گەلانی ڕۆژهەڵاتی
یان پێ چاو بەست دەکرد. کاتێ ڕۆژهەڵاتناسانیش زۆربەی ڕاستی و
اکەکانیان شاردۆتەوەو ڕووالەتی ڕۆژهەڵاتیان پێ شێواندووەو گەلانی
یان بەنەفام ودواکەوتوو ولاواز وەسف کردووە، هەر ئەوەش
ی تەواو بووە لە بنج داکوتانی نیازە نابەجێکانی داگیرکاریدا.. مادام
ڕۆژهەڵات ئینتیمای بۆ ڕەگەزێکی حوکم کراو هەبێت، ئەوا هەر
کم بکرێت. بەم بۆچوونە ترسناکە مافی حوکم داری ڕۆژهەڵاتیان بە
وو. لای ئەوان ڕۆژهەڵات بەهەموو گەلان ونەتەوەکانی‌یەوە
ی گەورەی دواکەوتوو داڕوخاو و ناشارستانی بووەو
شیان بەکەم عەقڵ وبێ سەلیقە لەقەڵەم داوە. ئیدی بە دەمامکی
چارەسازی وبنبڕ کردنی گرفت ومەینەتیی خولقێنراوی چەند
ە ئیمپریالیستیەکانیان بەرەو خاکی ئەو گەلانە ڕەوانە کردووە..

بەڵام لەپێش هەر شتێکی تردا (ئارەزووی- خاکەکەیان) کردووە،
سەرئەنجامیش نیازیان ڕیشەکێشکردنی ئەوەی بە (ئیمپراتۆریەتی عوسمانی)
ناودەبرا، بووە، لە دیراسە سەرەتاییەکانی پێش قۆناغی داگیرکردن وهەڵمەتە
عەسکەریەکانیان دا، هەوڵی کەم کردنەوەی فیکرو شارستانی‌یەتی ئیسلامیان
دەدا، بەڵام بیریارو زانایانی موسڵمانی ڕۆژهەڵات لە زۆر ڕووی زانستیەوە،
بەرپەرچەیان دەدانەوە، هەموو گومان وبۆچوونێکی نا ڕاستیان پوچەڵ
دەکردەوە، چونکە دەیانزانی ڕۆژئاوا بەتەمای ئەنجام دانی چ پیلانێکی
ژەهراوی‌یە... ڕۆژهەڵاتناسانی ئەڵقە لەگوێی دام ودەزگا جاسوس
وتەبشیریەکان هەمیشە تەقەلایان بۆ ئەوە دەدا، کە عەقیدەی ئیسلام وبیروباوەڕ
شوێن کەوتوانی وبەڵگە نەویستیەکانی- غیبیات- وکارە عیبادی وبەندایە
وخوا پەرستیەکانیان لەنێو بەرن، یان ئەو قسەو قسەڵۆکە سەیرو سەمەرانەیا
هزری موسڵماناندا جێگیر کەن، کە گوایە محمد (ﷺ) وەك سەدان پاڵەوان
لە ڕۆژهەڵاتدا تەنها پاڵەوانێکی مێژوو بووە (نەك پێغەمبەرێك). هەروەها گ
ڕێبازی (محمد)یش (ﷺ) لەو زنجیرە ڕێبازە مێژوویی‌یانەی ترەو هیچ جیاوا
لەگەڵیاندا نی‌یە، پاشان گوایە قورئانیش تەنها بۆ سەدەی یەکەم وئەو ڕۆ
پێویست بووەو هەموو حوکم ویاساکانیشی دەبێت بگۆڕرێت،
گۆڕانکاری وژیانی سەردەم دەستکاری بکرێت، هەتا وەك ئ
شێوێنراوەکەی خۆیانی لێ بێت. لەم سەردەمانەی دوایشدا چە
فرۆشێکی نێو جیهانی ئیسلامیان بەکرێ گرتبوو (لەوانەی ک
بەروناکبیر دادەنا)، یان کە بەرچەڵەك مەسیحی وجولەکە بوون ت
ئیمپریالی و تەبشیری وڕۆژهەڵاتناسی‌یەکانیان پێ جێبەجێ بکەن.
دەیان کەسی وەك (طه حسین) و(علي عبدالرزاق) و(ساطع الحص
أمین) وماسۆنی‌یەکانی (ئیتیحاد وتەرەقی)و چەندین دەروون بە
یەکێکی وەك (طـه حسین) لە هەردوو کتێبەکەیدا (الشعر الجاه

الـــثقافة في مصر)دا بەڕوونی وبێ پەردە تێڕوانینێکی نامۆو ڕیزپەڕو نادروستی بەرانــبەر (ڕۆژهــەڵات / بەگشــتی) و(میســـریش / بەتایــبەتی)دەربــڕیوەو، ویستوویەتی لـە دیدگایەکی ڕۆژئاواییەوە بۆ ڕۆژهـەڵات بڕوانێـت. هـەروەها بەتێفکرینـێکی (ڕۆژهەڵاتناسـیانە)وەو بەچـاویلکە دزێوەکـەی ئیمپریالـیزمەوە ڕۆژهـەڵات تـاووتوێ بکـات، پاشـان بـەڕای خـۆی هـەر ڕێبازو بەرنامەیـەك بـۆ گەلانی ڕۆژهەڵات هاتبێت بەشتێکی خراپ وشەڕ خوازی لەقەڵەم داوە. ئەمەش مانـای وایە ئاینی ئیسلام کە لەڕۆژهەڵاتدا سەری هەڵداوەو یەکەم جار بەگەلانی ڕۆژهـەڵات گەیەنـراوە، ئەو لـە چـاویلکە نابینـاکەیدا بەخـراپ وشـەڕ خـوازی بینیوە. بـەڵام هەر بەڕای خۆی هەر بەرنامەو تیۆرێك لەڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات هاتبێـت هـەمووی پـڕ لەخـێرو بەرەکـەت وچـاکەخوازی بـووە، تەنانـەت گـەر خراپەیەکیشی تێدا بوو بێت، ئەوا هەر لەو جۆرە چاویلکەیەی (طه حسین)ەوە دەبێـت پەسـەند بکرێـت. هەر بۆیەش ڕۆژهەڵاتناسێکی توندڕەوو دڵ ڕەشی وەك (هامیلـتۆن جـب) کاتێك دەربـارەی (طـــه حسـین)ی نوسیوە، گوتوویە ((ئەو بیرۆکەیـەی کـە "طه حسـین" خوازیـاری بوو: ڕزگارکردنی ئەدەبی عەرەبی‌یە لە چوارچێوە گشتی‌یە ئیسلامیەکەی)) [٣٢].

(طـــه حسین) لەسـاڵی (١٩٣٦ز)دا ویستی کلـتووری ئیسلامی عەرەب بە کلـتوورێکی ئەورووپی لـەقەڵەم بدات (نەك وەك کلتورێکی ڕۆژهەڵات)، بەوەش هـەوڵی دەدا ناسنامەیەکی دی بۆ نوخبەی ڕووناکبیرانی میسری دیاری بکات کە خۆیشی یەکێك بێت لەوان.

تەنانـەت تـا ئەمـڕۆش نوخـبەی ڕوناکـبیرانی عـەرەب سـەرەڕای پـەیدابوونی تەوژمـێکی بەهـێز بـۆ بەرهەڵستیو دژایەتی ئیمپریالـیزم، کەچی هەندێکیان هەر داکۆکـی لەسەر ئەو بیروڕایانەی (طه حسین) وهاوڕێکانی دەکەن. بەڵام نکوڵی

لەو واقیعە گەشەش ناکرێت کە لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەوە جیهانی ئیسلامی، ڕابونێکی شکۆدارو سەرتاپاگیری بەخۆوە بینیوەو بەسەدانء هەزاران ڕووناکبیرو بیریارو زانای ئیسلامی وسەدان سەرکردەی موسڵمانیش توانیویانە، سنوورێك بۆ هێرشی کلتووری وسیاسی وعەسکەری ڕۆژئاوا دابنێن و، ڕوویەکی ڕاستەقینەی درەوشاوەی گەلانی باوەڕداری ڕۆژهەڵات پیشان دەن.

**کەوابوو لەبەر ڕۆشنایی ئەم بڕگەیەی لێکۆڵینەوەکەماندا دەشێت مەسەلەی پەلهاویشتنی تەماعکارانەی ڕۆژئاواو سەپاندنی ڕکێف بەسەر ڕۆژهەڵاتدا لەم چەند خاڵەدا پوخت بکەینەوە:**

١- ڕۆژئاوا نیشتمانی ڕۆژهەڵاتناسان وپێگەی جموجوڵ وبنکەی پیلان بۆ دانراویان بووە، نەخاسمە فەرەنساو بەرتانیاو ئەڵمانیاو هۆڵەنداو هەنگاریا، هەندێکی تریشیان لە ئیتالیاو ئیسپانیاوە هاتوون، هەر وەك لە ئەمریکاشەوە دەرکەوتوون وچەند مەڵبەندێکیان تێدا هەبووە.

٢- هیچ حکومەت ودەزگاو کۆمپانیایەك یان هیچ دەزگاو دامەزراوەو کەنیسەیەکیش ڕۆژێ لە ڕۆژان دریغیان لە یارمەتی دانی پرۆسەی ڕۆژهەڵاتناسیدا نەکردووەو، هەمیشە کۆمەکی ماددی ومەعنەویشیان بۆ دەستە بەر کردوون و، چەندین زانکۆو پەیمانگەو ناوەندی پێوەندي داریان بۆ دامەزراندوون، تا بتوانن سەدان وهەزاران (ڕۆژهەڵاتناس) پێ بگەیەنن.

٣- گومانی تێدا نییە کە بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسی، تەنها بۆ خزمەتی ئیمپریالیزم وسەرخستنی پرۆگرامی تەبشیری وسیخوڕی پاوان کراوەو، دواییش خراوەتە خزمەتی بزاڤی زایۆنیزمەوە، کە تاکە ئەندێشەو ئامانجیان لاوازکردنی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی وکۆنترۆڵء دەسەڵات بەسەراگرتنیەتی، سا ئیتر بەهەر میتۆدو شێوازێکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆش بوو بێت.

❋❋❋ ❋❋❋

سیاسیو عەسکەرتارییەکان، نەك توێژینەوەی زانستیانەو خزمەتی ئامانجە مرۆیی یەکان حەشار دراون. هەر بۆیەش دوای گەشت و گەڕان و توێژینەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان قۆناغێکی ئاشکرای هێرشی سەربازیی بۆ داگیرکردنی خاکی موسڵمانان لە ڕۆژهەڵاتدا دەست پێ دەکات. پەیوەندیەکی بەتینیش لە نێوان (سیاسەت و تەوژمی ڕۆژهەڵاتناسیی)دا هەبووە (ئیدوارد سعید)یش لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (الاستشراق) باسي ئەو پەیوەندیانەی کردوە، کە گەورەترین گریمان بۆ بەکارهێنانی فیکرە دەرهاوێژراوەکانی تایبەت بە ڕۆژهەڵات بەنیازە سیاسییەکانەوە بەند بووە.. ئەمەش بەڕای (ئیدوارد سعید) زۆر گرنگ و حەساسە، هەروەك لە لاپەڕە ١٢١ ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کردوە. لێرەشدا بۆ نمونە ئاماژە بۆ هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەکەین کە لێکۆڵینەوەکانیان خستۆتە خزمەتی نیازە ئیمپریالیو داگیرکاریەکانەوە وەك [٢٧]:

١- (کارل هینریش بیکەر) کە دامەزرێنەری گۆڤاری ئەڵمانی (ئیسلام) بووەو چەندین دیراسەو لێکۆڵینەوەی بە مەبەستی بەدی هێنانی نیازە ئیمپریالیەکان لە ئەفریقادا تیادا نوسراوە.

٢- (بارتۆڵد) ئەویش دامەزرێنەری گۆڤارێك بوو بۆ ئەو مەبەستەو هەر بەناوی (ئیسلام)و بە زمانی ڕووسیش بلاوکراوەتەوە و، چەند بابەتێکی بۆ سوود گەیاندن بە بەرژەوەندییەکانی ڕووسیا لە ناوچەی ئاسیای ناوەڕاستدا تێدا نوسراوە.

٣- (سنۆك هێرگرۆنگ)ی هۆڵەندی کە لە ساڵی (١٨٨٢ز) بەناوێکی خواستراوی وەك (عبدالغفار) چووە بۆ مەککەو تەنها شەش مانگیش ماوەتەوە، پاشان گەڕاوەتەوە و ڕاپۆرتێکی بۆ ئیمپریالیستەکان لەسەر (ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی) نووسیوە. ناوبراو لەوەو بەریش (١٧) ساڵ لە (جاوە) ژیاوە.

٤- پەیمانگەی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان لە پاریس و کاری سەرجەم ڕۆژهەڵاتناسەکانی، کە ساڵی (١٨٨٥ز) دایان مەزراندووە پەیداکردن و گردکردنەوەی چەندین زانیاریی لە سەر وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ناوچەی (ڕۆژهەڵاتی نزیك) بووە، تاکو زەمینە بۆ سوپاکانیان خۆش کەن. وەك (د. فەرهاد پیربال)یش دەڵێت (داگیرکردنی میسر لەلایەن ناپلیۆن پۆناپارت لە ساڵی (١٧٩٨ز-١٨٠١ز)و پاشان داگیرکردنی جەزائیر لە سەردەمی (لویس فیلیپ)دا لە ساڵانی (١٨٣٠- ١٨٤٨)، ئەم دوو ڕوداوە پێویستیی دەوڵەتی فەرەنسای بە وەرگێڕو زمانزانان و ڕۆژهەڵاتناسان زیاتر کردووە، هەروەها هانی دەوڵەتی فەرنسای‌دا کە بیر لە داگیرکردنی وڵاتانی وەك دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانیش بکاتەوە) [٢٨].

٥- (پییێر ئامێدی ژووبێرت)- (١٧٧٩- ١٨٤٧) دیبلۆماتێکی ناوداری فەرەنسییەو کورە پارێزەرێکی ناودارو، قوتابی قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان لە پاریس و، موتەرجیمی ناپلیۆن بوو لە کاتی داگیرکردنی میسر لە ساڵی (١٨٠٤)دا، (ناپلیۆن) بە وەفدێك دەینێرێت بۆلای شای ئێران (٢٩).

٦- (فاردینبێرگ) نەیدەتوانی نکوڵی لە ڕۆڵی چەواشەکارانەی ڕۆژهەڵاتناسان و پەیوەست بوونیان بەڕێنمایی داگیرکەرانەوە بکات. ساڵی (١٨٧٣)ش لە یەکەمین کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناساندا توێژەرەوەکان هەستیان بە پێویستی ناسینی یەکتر دەکرد. (سنۆك)یش ڕاستەوخۆ لە دوای دیراسەکردنی ئیسلام و توێژینەوەکانی ئەو بوارە دەبێتە ڕاوێژکاری حکومەتی هۆڵەندی لە کاروباری ئیداری کۆلۆنیال (مستعمرە)ی موسڵمان نشینەکانی (ئیندۆنیسیا)دا (٣٠).

٧- (ماکدۆنالد و ماسینیۆن)یش لەسەر ئاستێکی باڵا لەلایەن ئیدارە داگیرکاری‌یەکانەوە ڕاوێژیان لەگەڵدا دەکراو بەو پێوادانگەی دوو پسپۆڕو شارەزای بارودۆخی جیهانی ئیسلامیین لە (باکوری ئەفەریقا)وە تاکو (پاکستان)، هەروەك (فاردنبیرگ)یش دەڵێت: (بەڵام بەکورتەیەکی زیادە ڕۆیی‌یەوە ئەو پێنج توێژەرەوەیە لە کاتێکی دیاری کراودا دیدو بۆ چونێکی وەهایان لە سەر ئیسلام دارشتووە، کە کاریگەریەکی فراوانی لەسەر هەموو ناوەندە حکومی‌یەکانی جیهانی ڕۆژئاوا هەبووە)[٣١].

پێوەندیی "ڕۆژهەڵاتناسیی" بە "ئیمپریالیزم"ەوە، ئاتاجی بە چەندین لێکۆڵینەوە هەیە، هەر لەسەردەمی پێش هێرشەکانی (ناپلیۆن) و(کانیفا) و ئیتالیەکانەوە، تا سەردەمی دوای جەنگە جیهانی‌یەکانی سەدەی بیست. ئەوە بوو فیکری (ڕۆژهەڵاتناسیی) لە هەردوو هەڵمەتەکەی بەریتانیاو فەرەنسادا بۆ سەر وڵاتانی عەرەبی و کوردستان وباکوری ئەفریقاو ڕۆژئاوای ئاسیاش ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لەو هەنگاوە ئیعلامیانەدا، کە گەلانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیان پێ چاو بەست دەکرد. کاتێ ڕۆژهەڵاتناسانیش زۆربەی ڕاستی و لایەنە چاکەکانیان شاردۆتەوەو ڕووالەتی ڕۆژهەڵاتیان پێ شێواندووەو گەلانی ڕۆژهەڵاتیان بەنەفام ودواکەوتوو ولاواز وەسف کردووە، هەر ئەوەش هاندەرێکی تەواو بووە لە بنج داکوتانی نیازە نابەجێکانی داگیرکاریدا.. مادام لای ئەوان ڕۆژهەڵات ئینتیمای بۆ ڕەگەزێکی حوکم کراو هەبێت، ئەوا هەر دەبێت حوکم بکرێت. بەم بۆچوونە ترسناکە مافی حوکم داری ڕۆژهەڵاتیان بە خۆیان دابوو. لای ئەوان ڕۆژهەڵات بەهەموو گەلان ونەتەوەکانی‌یەوە ناوچەیەکی گەورەی دواکەوتوو داڕوخاو و ناشارستانی بووەو دانیشتوانەکەشیان بەکەم عەقڵ وبێ سەلیقە لەقەڵەم داوە. ئیدی بە دەمامکی خێرخوازی و چارەسازی وبنبڕ کردنی گرفت ومەینەتیی خولقێنراوی چەند گەلێکەوە، هێزە ئیمپریالیستیەکانیان بەرەو خاکی ئەو گەلانە ڕەوانە کردووە..

بەڵام لەپێش هەر شتێکی تردا (ئارەزوی- خاکەکەیان) کردووەو، سەرئەنجامیش نیازیان ڕیشەکێشکردنی ئەوەی بە (ئیمپراتۆریەتی عوسمانی) ناودەبرا، بووە، لە دیراسە سەرەتاییەکانی پێش قۆناغی داگیرکردن وهەڵمەتە عەسکەریەکانیان دا، هەوڵی کەم کردنەوەی فیکرو شارستانی‌یەتی ئیسلامیان دەدا، بەڵام بیریارو زانایانی موسڵمانی ڕۆژهەڵات لە زۆر ڕووی زانستیەوە، بەرپەرچەیان دەدانەوە، هەموو گومان وبۆچوونێکی ناڕاستیان پوچەڵ دەکردەوە، چونکە دەیانزانی ڕۆژئاوا بەتەمای ئەنجام دانی چ پیلانێکی ژەهراوی‌یە... ڕۆژهەڵاتناسانی ئەڵقە لەگوێی دام ودەزگا جاسوسی وتەبشیریەکان هەمیشە تەقەلایان بۆ ئەوە دەدا، کە عەقیدەی ئیسلام وبیروباوەڕی شوێن کەوتوانی وبەڵگە نەویستیەکانی- غیبیات- وکارە عیبادی وبەندایەتی وخواپەرستیەکانیان لەنێو بەرن، یان ئەو قسەو قسەلۆکە سەیرو سەمەرانەیان لە هزری موسڵماناندا جێگیر کەن، کە گوایە محمد (ﷺ) وەك سەدان پاڵەوانی تر لە ڕۆژهەڵاتدا تەنها پاڵەوانێکی مێژوو بووە (نەك پێغەمبەرێك). هەروەها گوایە ڕێبازی (محمد)یش (ﷺ) لەو زنجیرە ڕێبازە مێژوویی‌یانەی ترەو هیچ جیاوازیەکی لەگەڵیاندا نی‌یە، پاشان گوایە قورئانیش تەنها بۆ سەدەی یەکەم وئەو ڕۆژگارە پێویست بووەو هەموو حوکم ویاساکانیشی دەبێت بگۆڕرێت، بەپێی گۆڕانکاری وژیانی سەردەم دەستکاری بکرێت، هەتا وەك ئینجیلە شێوێنراوەکەی خۆیانی لێ بێت. لەم سەردەمانەی دوایشدا چەند قەڵەم فرۆشێکی نێو جیهانی ئیسلامیان بەکرێ گرتبوو (لەوانەی کە خۆیان بەڕوناکبیر دادەنا)، یان کە بەرەچەڵەك مەسیحی وجولەکە بوون تاکو مەرامە ئیمپریالی‌و تەبشیری وڕۆژهەڵاتناسی‌یەکانیان پێ جێبەجێ بکەن.. بەتایبەتیش دەیان کەسی وەك (طه حسین) و(علي عبدالرزاق) و(ساطع الحصري) و(قاسم أمین) وماسۆنی‌یەکانی (ئیتتیحاد وتەرەقی)و چەندین دەروون بەزیوی تریان.. یەکێکی وەك (طـه حسین) لە هەردوو کتێبەکەیدا (الشعر الجاهلي) و(مستقبل

الـثقافة في مصر)دا بەڕوونی وبێ پەردە تێڕوانینێکی نامۆو ڕیزپەڕو نادروستی بەرانـبەر (ڕۆژهـەڵات / بەگشـتی) و(میسـریش / بەتایـبەتی)دەربـڕیوەو، ویستوویەتی لـە دیدگایـەکی ڕۆژئاوایـیەوە بۆ ڕۆژهـەڵات بڕوانێـت. هـەروەها بەتێفکرینـێکی (ڕۆژهەڵاتناسـیانە)وەو بەچـاویلکە دزێوەکـەی ئیمپریالـیزمەوە ڕۆژهـەڵات تـاووتوێ بکـات، پاشـان بـەڕای خـۆی هـەر ڕێبازو بەرنامەیـەك بـۆ گەلانی ڕۆژهەڵات هاتبێت بەشتێکی خراپ وشەڕ خوازی لەقەڵەم داوە. ئەمەش مانـای وایە ئاینی ئیسلام کە لەڕۆژهەڵاتدا سەری هەڵداوەو یەکەم جار بەگەلانی ڕۆژهـەڵات گەیەنـراوە، ئـەو لـە چـاویلکە نابیناکەیدا بەخـراپ وشـەڕ خـوازی بینیوە. بەڵام هەر بەڕای خۆی هەر بەرنامەو تیۆرێك لەڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات هاتبێـت هـەمووی پـڕ لەخـێرو بەرەکـەت وچـاکەخوازی بـووە، تەنانـەت گـەر خراپەیەکیشی تێدا بوو بێت، ئەوا هەر لەو جۆرە چاویلکەیەی (طە حسین)ەوە دەبێـت پەسـەند بکرێـت. هەر بۆیەش ڕۆژهەڵاتناسێکی توندڕەوو دڵ ڕەشی وەك (هامیلـتۆن جـب) کاتێك دەربـارەی (طــە حسین)ی نوسیوە، گوتوویە ((ئەو بیرۆکەیـەی کـە "طە حسـین" خوازیـاری بوو: ڕزگارکردنی ئەدەبی عەرەبی‌یە لە چوارچێوە گشتی‌یە ئیسلامیەکەی))[٣٢].

(طــە حسین) لەسالّی (١٩٣٦ز)دا ویستی کلتووری ئیسلامی عەرەب بە کلتوورێکی ئەورووپی لەقەڵەم بدات (نەك وەك کلتورێکی ڕۆژهەڵات)، بەوەش هـەوڵی دەدا ناسنامەیەکی دی بۆ نوخبەی ڕووناکبیرانی میسری دیاری بکات کە خۆیشی یەکێك بێت لەوان.

تەنانـەت تـا ئەمـڕۆش نوخـبەی ڕوناکـبیرانی عـەرەب سـەرەڕای پـەیدابوونی تەوژمێکی بەهێز بۆ بەرهەڵستیو دژایەتی ئیمپریالـیزم، کەچی هەندێکیان هەر داکۆکـی لەسەر ئەو بیروڕایانەی (طە حسین) وهاوڕێکانی دەکەن. بەڵام نکوڵی

لەو واقیعە گەشەش ناکرێت کە لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەوە جیهانی ئیسلامی، ڕابونێکی شکۆدارو سەرتاپاگیری بەخۆوە بینیوەو بەسەدانء هەزاران ڕووناکبیرو بیریارو زانای ئیسلامی وسەدان سەرکردەی موسڵمانیش توانیویانە، سنوورێك بۆ هێرشی کلتووری وسیاسی وعەسکەری ڕۆژئاوا دابنێن و، ڕوویەکی ڕاستەقینەی درەوشاوەی گەلانی باوەڕداری ڕۆژهەڵات پیشان دەن.

**کەوابوو لەبەر ڕۆشنایی ئەم بڕگەیەی لێکۆڵینەوەکەماندا دەشێت مەسەلەی پەلهاویشتنی تەماعکارانەی ڕۆژئاواو سەپاندنی ڕکێف بەسەر ڕۆژهەڵاتدا لەم چەند خاڵەدا پوخت بکەینەوە:**

١- ڕۆژئاوا نیشتمانی ڕۆژهەڵاتناسان وپێگەی جموجوڵ وبنکەی پیلان بۆ دانراویان بووە، نەخاسمە فەرەنساو بەرتانیاو ئەڵمانیاو هۆڵەنداو هەنگاریا، هەندێکی تریشیان لە ئیتالیاو ئیسپانیاوە هاتوون، هەر وەك لە ئەمریکاشەوە دەرکەوتوون وچەند مەڵبەندێکیان تێدا هەبووە.

٢- هیچ حکومەت ودەزگاو کۆمپانیایەك یان هیچ دەزگاو دامەزراوەو کەنیسەیەکیش ڕۆژێ لە ڕۆژان درێغیان لە یارمەتی دانی پرۆسەی ڕۆژهەڵاتناسیدا نەکردووەو، هەمیشە کۆمەکی ماددی ومەعنەویشیان بۆ دەستە بەر کردوون و، چەندین زانکۆو پەیمانگەو ناوەندی پێوەندي داریان بۆ دامەزراندوون، تا بتوانن سەدان وهەزاران (ڕۆژهەڵاتناس) پێ بگەیەنن.

٣- گومانی تێدا نییە کە بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسی، تەنها بۆ خزمەتی ئیمپریالیزم وسەرخستنی پرۆگرامی تەبشیری وسیخوڕی پاوان کراوەو، دواییش خراوەتە خزمەتی بزاڤی زایۆنیزمەوە، کە تاکە ئەندێشەو ئامانجیان لاوازکردنی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی وکۆنترۆڵء دەسەڵات بەسەراگرتنیەتی، سا ئیتر بەهەر میتۆدو شێوازێکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆش بوو بێت.

❀❀❀ ❀❀❀

# ڕۆژهەڵاتناسیی و زایۆنیزم

لەمێژووی پڕ لە غەدرو خیانەتی پرۆسەی ڕۆژهەڵاتناسی‌دا، ناوی دەیان وبگرە سەدان کەسیش بەدی دەکرێت لەوانەی کە ڕەچەڵەکێکی یەهوودی‌یان هەبووە، یان بەئاشکرا یەهوودی بوون. هەر کەسێکیش بەوردی لە ژیان وکەسێتیان بکۆڵێتەوەو دۆسیەی نیازو ڕەفتارەکانیان هەڵداتەوە بەڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە زۆربەیان (زمانی عەرەبی)، یان زمانی گەلە موسڵمانەکانی تریان زانیوە. چونکە زانینی زمان وشارەزا بوون لە ئەدەبیات وفەرهەنگیان، گەلێك پێویست بووە بۆ ئەو کەسەی ئەرکەکەی پێ سپێرراوە بۆ زیان گەیاندن بەو میللەتە موسڵمانانەو شێواندنی عەقیدەیان.

**لەم بڕگەیەشدا بەکورتی ئاماژە بۆ دیارترین وناسراوترینی ئەو ڕۆژهەڵاتناسە یەهوودیانە [٣٣] دەکەین وهەوڵ دەدەین لە (ڕۆژهەڵاتناسی جولەکەو زایۆنیزمیش) بکۆڵینەوە..**

١- ئەجنتس گۆڵدسیهەر: (١٨٥٠- ١٩٢١ز): ڕۆژهەڵاتناسێکی جولەکەی مەجەری (واتە هەنگاری بووە). لەشاری (بۆدابست) خوێندوویەو پاشان ساڵی (١٩٦٩ز) چووە بۆ (بەرلین). دوای ساڵێك وازی لەوێ هێناوەو چووە بۆ (لیبیستك)و لەلای (فیشەر)[٣٤] خوێندوویەتی. (گۆڵدسیهەر) بەهەوڵ وتەقەلاو ڕێنماییەکانی ئەم مامۆستایەی (واتە فیشەر)، توانیویەتی ساڵی (١٨٧٠ ز) بڕوانامەی دکتۆرا وەرگرێت. (سیهەر)[٣٥].. لەڕووی سیاسیەوە یەکێك بووە لە قوتابیە هەرە دیارو هەڵکەوتووەکانی (هرتزل). هەروەها لە دانیشگای ئەزهەریش لە- قاهیرە- شەریعەتی ئیسلامی خوێندووەو خۆی بەبەرگێکی

ئیسلامی‌یەوە پیشان داوە. زمانی عەرەبیشی زانیوەو شارەزایی تێدا پەیدا کردووە. بەڵام بەپەنهانی سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەرکێکی سیخوڕی بووە، ئەمەش بە فەرمانی ڕاستەوخۆی بزووتنەوەی زایۆنیزم. ڕۆڵێکی سەرەکیشی لە دامەزراندنی زانکۆی (عیبری) لەشاری (قودس) لە ساڵی (١٩١٩ز)داو دواتر ڕێخۆشکردن بۆ پرۆژەی نیشتەجێ کردنی جولەکە لە فەلەستیندا هەبووە، ئەم ڕۆژهەڵاتناسە جوولەکەیە چەندین کتێب ولێکۆڵینەوەو وتاری لەسەر ئیسلام نوسیوە. بەڵام لە ژیانی‌دا بەو کتێبە دیارە ناسراوە، کە بەناوی (تەفسیری قورئان)ەوە نوسیویەتی. گەورەترین هەوڵیشی ئەوەبوو داوای دەکرد سەر لەنوێ پەیکەرە دێرینەکەی ڕەمزی دەوڵەتی بەناو (ئیسرائیل) دابنرێتەوە. کاتێك پێناسەی- ماسۆنی‌یەت- یشی کردووە، گوتوویەتی: (کۆمەڵێکی گەورەیەو پێکهاتەی چەند ڕێبازێکی هەمەجۆرە، کە بۆ یەك ئامانج تێ‌دەکۆشن، ئەویش دارشتنەوەی پەیکەرە کۆنەکەی هێمای ئیسرائیلە). بەم پێناسەیەش بیروڕای بنچینەیی خۆی وهاوڕێکانی لەسەر ماسۆنی‌یەت بەوە دەردەخات، کە لە وەسف کردنیدا دەڵێت گوایە دەزگایەکی یەهوودی‌یە بەهەموو فیکرو پەیڕەوو پرۆگرامء وشە نهێنی‌یەکانیشیەوە.

٢- (داڤید سامۆئیل مارجلیۆس)- (١٨٨٠- ١٩٥٩ز): ڕۆژهەڵاتناسێکی جولەکەیەو بەڕەگەز خەڵکی شامە. کۆچی کردووە بۆ ئینگلتەراو لە زانکۆی (ئۆکسفۆرد) وەك پرۆفیسۆرێکی دیراساتی ڕۆژهەڵات کاری کردووە، ساڵی (١٩٢٠) کتێبێکی بلاوکردۆتەوە بەناوی (تفسیر سورة ال عمران علی شرح البیضاوي). لەساڵی (١٩٠٥) یشەوە دەستی کردبوو بەبلاوکردنەوەی بیروڕا نا دروستەکانی لەسەر ئیسلام، کە کتێبی (محمد ونشأة الإسلام) یەکەم هەوڵی لەو چەشنەی بوو. ساڵی (١٩١١)ش کتێبێکی بەناوی (الإسلام) بلاوکردۆتەوە. لەم کتێب ولێکۆڵینەوانەیدا ناخی پڕ لەڕق وکینەی ڕەشی بەتاڵ کردۆتەوە.

کەچی سەیر لەوەدا بوو دەزگای کۆڕی زانیاری عەرەبی (المجمع العلمي العربي) لە دیمەشق بە ئەندامێکی (مراسل) وەریان گرتبوو، واتە وەك یەکێك لە ئەندامە دوورەکان، کە لە دەرەوەی دەزگاکەوە بابەت ولێکۆڵینەوەیان بۆ دەنوسێت نەك وەك ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری بێت. ئەوەی زیاتر لەبارەی (مارجلیۆس)ەوە زانراوە ئەوەیە، کاریگەریەکی زۆرو فیعلی لەسەر (ئینتۆنی ئایدن) هەبووە، کە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بووە لەو سەردەمەداو، تەنانەت (ئایدن) هەتا ڕەزامەندی ئەم کابرایەی وەر نەگرتایە، هیچ بڕیارێکی نوێی سیاسی لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەرنەدەکرد. (مارجلیۆس)یش وەك (سیهەر) هەر تەنها بایەخی بە مەسەلە ئاینییەکانی ئیسلام نەداوە، بەڵکو پەلی بۆ زمانی عەرەبیش هاویشتووە. بەڵام لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی (زمانی قورئان و شیکاری ئیسلام بووە) هێندە بەتوندی ڕەخنەی بۆ لێنەگیراوەو زیاتر جامی ڕق و کینەی لەسەر شێوە زمانەکانی وئەو هۆزو گەلانەدا قلْپ کردۆتەوە کە قسەیان پێ کردووە.

٣- گۆستاف فۆن گرۆنبۆم (١٩٠٩- ١٩٧٢ز).. ڕۆژهەڵاتناسێکی نەمساییەو لە ئەیلولی (١٩٠٩) لە شاری ڤییەننا لەدایك بووە.. چەند قۆناغێکی خوێندنی لەقوتابخانەو دانیشگاکانی (ڤییەننا)دا تەواو کردووەو دوایی لە زانکۆی (بەرلین)یش خوێندوویەتی. بەڵام کاتێك ئەڵمانیا لەساڵی (١٩٣٨)دا ویستی نەمسا بخاتە پاڵ خۆی، (گرۆنبۆم) بەو پێودانگەی، کە لەخێزانێکی یەهوودییە بەرەو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕۆیشتووە کەچی وێڕای ئەوەش بووە بە (کاسۆلێکی)و ڕەگەزنامەی ئەمریکایی دەست کەوتووەو، پاشان لەزانکۆی (نیویۆرك) لەساڵی (١٩٣٨)دا وەك مامۆستا دامەزراوەو، دوای ئەمەش لەساڵی (١٩٤٣) چووە بۆ زانکۆی (شیکاگۆ) وساڵی (١٩٥٧)یش لەزانکۆکانی (کالیفۆرنیا) و(لۆس ئەنجلوس)دا بووە بە مامۆستاو بەسەرۆکی بەشی دیراساتی ڕۆژهەڵاتی وتا کۆتایی تەمەنی لەو کارەدا

ماوەتەوە. ناوبراو چەندین لێکۆڵینەوەو بابەتی جۆراو جۆری ئەدەبی وفیکری لەسەر شیعرو ئەدەبی عەرەبی هەیە، هەرچەندە خۆی واپیشان داوە گوایە لە شارستانی‌یەتی ئیسلامی‌دا شارەزایە، بەڵام نەیتوانیوە ڕق و کینەی خۆی بەرانبەر موسڵمانان وئیسلام بشارێتەوە. (گرۆنیۆم) لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناسێکی هاوڕێیدا، کە ئەویش جوولەکە بوو وناوی (پۆل کراوس) بوو، لە زانکۆی میسردا بڕیاریان دا، کە ئەو هەواڵە مێژوویی‌یە ناڕاستە بڵاوبکەنەوە، کە گوایە پێغەمبەری خودا (ئەیوب) بە (شیعری عیبری) لەخودا پاڕاوەتەوە. ئەمەش بەو مانایەی گوایە (شیعری عیبری) لە شیعری (جاهیلی)ی پێش ئیسلام کۆنترە، بەم پێیەش بیگەڕێننەوە بۆ سەر ئەو مەبەستە ڕەگەز پەرستی‌یە بنچینەییەیان، کە گوایە (بنو إسرائيل) ڕێزو (فضل)یان لەپێش هەر نەتەوەیەکی ترەوەیە.

٤- (ئەلفرێد گلیۆم)- (١٨٨٨- ١٩٦٥) مامۆستایەکی زمانی عەرەبی بووە لە پەیمانگای دیراساتی (عەرەبی- ئەفریقی) وسەرۆکی فەرمانگەی کاروباری (ڕۆژهەلاتی دوور) و(ڕۆژهەلاتی نزیك)یش بووە لە زانکۆی لەندەن، ماوەی هەشت ساڵ (١٩٤٧ تا ١٩٥٥ز) لەو پلەیەدا بووە. خزمەتی سەربازیشی لەنێو ڕیزەکانی سوپای- بەریتانیا- لە- میسردا- کردووە لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانی‌دا. ساڵی (١٩٤٤) لە (زانکۆی ئەمریکی) لە (بەیروت) تا ساڵی (١٩٤٥) خوێندوویەتی، واتە: لەو ماوەیەدا کە سەرکردەکانی بزاڤی زایۆنیستی لە- لوبنان- بوون. (گلیۆم)یش توانیویەتی ببێت بە یەکێك لە ئەندامانی (کۆڕی زانیاری عەرەبی)ی- دیمەشق- لە ساڵی (١٩٤٩) و، پاشان (کۆڕی بەغداش/مجمع بغداد) لە ساڵی (١٩٥٠)دا. پاشان لە ساڵی (١٩٥٥)ەوە تا ساڵی (١٩٥٧) وەك مامۆستایەکی میوان یان وانەبێژ (محاضـــر) لە فەرمانگەی (زمانی عەرەبی)ی سەر بە دانشگای (برنستۆن)ی ئەمریکادا کاری کردووە. ناوبراو کتێبێکی پڕ لە گومان و توانج وتۆمەتی

لەسەر ئیسلام وموسڵمانان نوسیوە، وەك (تقالید الإسلام) و(النبوّة والكهانة) و(حـیاة محمد وتـراث الإسلام) و(تأثیر الیهودیة علی الإسلام) وهەندێكیان بۆ زمانەكانی (عەرەبی) و(ئیتالی) و(ئیسپانی) تەرجەمەكراون. هەروەها لە كتێب وبلاوكراوەكانی دەزگای (المعارف الإسلامیه) یان (الموسوعة الإسلامیة) دا گەلێك بوختان وتاوانی داوەتە پاڵ موسڵمانان وویستوویەتی هەموو دیراسەو نوسینەكانی بەمۆرك وفیكرێكی یەهوودی و زایۆنیستیەوە بلاوبكاتەوە. دوای خۆی ڕۆژهەڵاتناسێكی توندڕەوی وەك (هامیلتۆن جب) لەبەشی زمانی عەرەبی زانكـۆی (ئۆكسـفۆرد)دا جـێی گـرتۆتەوەو كتێـبە پـڕ لـە ڕق ونـیازە دوژمنكاری‌یەكانی بۆ پڕكـردۆتەوە. بێ گومـان ئـەم چـوار نـاوەی پێشـوو نموونەیەكی بچووكن لەو سەدان نموونەیەی كە بزاڤی (ئیمپریالیزم) و(زایۆنیزم) چ سوودێكیان لە (ڕۆژهەڵاتناسی) وڕۆژهەڵاتناسەكانیان بینیوە. خۆ ئەگەر هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسە جوولەكانە ڕۆڵێكی نهێنییان نمایش كردبێت لەكاری بەناو ڕۆژهەڵاتناسینیانداو، تەنها لە گۆشەیەكی پەنهانی‌یەوە خزمەتێكی بزاڤی زایۆنیان كردبێت، بەڵام چەندان ڕۆژهەڵاتناسی تری جوولەكە بە ئاشكرا لە پێناوی بەگەڕ خستنی زایۆنیزم وبەدیهێنانی قەوارە ڕەگەزپەرستیەكەیان هەڵسوڕاون ودەوری خۆیان نەشاردۆتەوە. چونكە بە ڕاشكاوی هەموو پسپۆڕی وشارەزاییەكیان لەپێناوی ئاسان كردنی كاري سەركردەكانی بزاڤی زایۆنیستی، بە تایبەتیش لەپێناوی سەركردەی دیاریان (تیۆدۆر هرتزل)دا بووە..

**جا لێرەدا بۆ نموونەو بەكورتی ئاماژە بۆ هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانەش دەكەین لەگەڵ پوختەیەك لە ژیانیاندا(٣٦):-**

١-ولـیەم هـیلكر(١٨٤٥- ١٩٣١) قەشـەیەكی ئەنگلـیكانی بـووەو كاربەدەستێكی باڵوێزخانەی بەریتانیا بووە لە (ڤیەننا). ناوبراو لە نێوان ڕێچكەی (زایۆنیزمی یەهوودی) و(زایۆنیزمی غەیرە یەهوودی)دا ئەڵقەیەكی

پەیوەندی بووە لە ئەفریقا، لە باوك ودایكێكی ئەڵمانی سەر بەمەزهەبی (پرۆتستانت) لەدایك بووە. هەمیشە بە ئاشكرا خۆشەویستی وهاوسۆزی بۆ ئەوەی ناوی بە (گەلی دێرینی خودا) دەبرد، دەردەبڕی وبەردەوام لەهاندانی نیشتەجێ كردنی جوولەكەدا بوو لەخاكی فەلەستیندا. بەكردەوەش چووە بۆ فەلەستین بۆ دیراسەكردنی كاری نیشتەجێ كردنی هەمیشەیی جولەكەكان لەو وڵاتە ئیسلامیەدا. لەساڵی (١٨٩٤)دا كتێبێكی نوسیوە بەناوی (گێڕانەوەی جوولەكە بۆ فەلەستین) ئەم كتێبەشی دوو ساڵ پێش كتێبەكەی (هرتزل) نوسیوە، كەناوبراو واتە هرتزلی سەركردەی زایۆنیزم كتێبێكی بەناوی (دەوڵەتی یەهوودی)یەوە نوسیبوو، ساڵی ١٨٨٢ حكومەتی بەریتانیا (هێلكر)یان بۆ (ئەستانە) ناردووە بۆ دیداری سوڵتانی عوسمانی (عبدالحمیدی دووەم) وگفت وگۆیەك لەگەڵیدا لەمەڕ داگیركردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە، بەو مەبەستەی قەناعەت بە سوڵتان (عبدالحمید) بكات، كە لەهیچ پەیمانـنامەیەك لەگەڵ (ئەڵمانیا) و(نەمسا)دا خۆی تێوە نەگلێنێت. هەروەها ئەم ڕۆژهەڵاتناسە لەهەموو نوسینەكانیدا مۆركێكی سیاسی وئیمپریالیانە لە ئەفكاریدا ڕەنگی داوەتەوە، بەتایبەتیش لەو كتێبەیدا دەربارەی گێڕانەوەی جولەكە بۆ فەلەستین وتێیدا باسی پێشبینییە هەڵبەستراوەكانی نێو (تەورات) و چەند وتەیەكی دروستكراوی پێغەمبەرانی خۆیانی كردووە.

٢-(ئەرمینۆس گامبیري)یش ڕۆژهەڵاتناسێكی جوولەكەو خەڵكی مەجەرستان واتە (هەنگاریا) بووەو هرتزل بۆ دیدارو چاوپێكەوتنی سوڵتانی عوسمانی بەكاری هێناوە، چونكە ناوبراو پەیوەندییەكی تایبەتیی لەگەڵ سوڵتاندا هەبووە. جگە لەوەی شارەزای زمانەكانی ڕۆژهەڵات بووەو لە گەورەترینی فەرمانبەران و داگیركردنی فەلەستینیان ئاسان كردووە.

٣-(لۆرانس ئۆلیڤانت)- (١٨٢٩- ١٨٨٨) لە باشووری ئەفریقا، لە باوك ودایکێکی ئینگلیز لە دایك بووەو، لە دەزگای دیبلۆماسیی بەریتانیدا کاری کردووە. هەروەها پەیامنێرێکی ڕۆژنامەی (تایمز)ی لەندەنی بووە، لەکاتی جەنگی (قرم)دا، کە لەماوەی نێوان ساڵانی (١٨٥٤- ١٨٥٦)دا ڕووی داوەو لەدوای ساڵی (١٨٥٦)ەوە بووەتە ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیا. (ئۆلیڤانت) یەکێ بووە لەو ڕۆژهەڵاتناس وکەسێتیە ئەوروپاییانەش، کە هاوسۆزیەکی تەواوی لەگەڵ پرۆژەی نیشتەجێ کردنی جوولەکە لەفەلەستیندا هەبووە. بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو (مسح)ی زەوی‌و زارەکەی سەردانی فەلەستینی کردووەو لەبارودۆخی کشتوکاڵی ناوچەکەی کۆڵیوەتەوە. یەکێ لە وتەکانیشی ئەوەیە کە گوتوویە: (فەلەستین دەبێت بۆ جوولەکە بێت، عەرەبەکانیش با بچن بۆ بیابان و حوشتر و ئاژەڵەکانیان لەگەڵ خۆیان بەرن، چونکە لەوە زیاتر شایانیان نییە).. لەدوایشدا ناوبراو ژیانی لەشاری (حەیفا)ی فەلەستیندا بەسەر بردووەو کتێبێکی بەناونیشانی (حەیفا- وژیان لە فەلەستینی نوێدا) نوسیوە، لەگەڵ (داڤید بین گۆریۆن)وچەندان ڕۆژهەڵاتناسی جوولەکەو مەسیحی تردا بەشداری کۆنگرەکانی ڕۆژهەڵاتناسانیان کردووە، بەتایبەتی ئەو کۆنگرەیەی لە ژێر دروشمی (مژدەوانی- تبشیر- بەڕۆژهەڵاتناسیەوە وەك توێژینەوەیەکی زانستی و تەرخان کردنی بە پەنهانی لەپێناو بەرژەوەندیەکانی ئیسرائیل و ڕۆژئاوادا) بەسترا.

٤-(پۆڵ کراوس)- (١٩٠٤- ١٩٤٤) لە خێزانێکی جوولەکە لەشاری (پراگ)ی چیکۆسلۆفاکیا لەدایك بووە، کە ئەوسا ئەم وڵاتە بەشێك بوو لە ئیمبراتۆریەتی (نەمسا). ساڵی ١٩٢٢ چووە بۆ (دیراساتی ڕۆژهەڵاتی)ی سەر بە (زانکۆی عەرەبی) لە قودس خوێندوویەتی، هەر لەو ماوەیەشدا فێری زمانی عەرەبی بووە. لەساڵی (١٩٢٧) لە زانکۆی (بەرلین) وەرگیراوەو، تا پلەی (دکتۆرای) بەدەست هێناوە. یەکێك لە مامۆستاکانی کەناوی (یۆلیۆس

ڕۆسکا) بووە، کردوویەتی بەیاریدەدەرێکی خۆی لە پەیمانگای (لێکۆڵینەوەو زانستییەکان)ی بەرلین لەساڵی (١٩٢٩)دا، تاکو بەوردی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی (کیمیا لەلای موسڵمانەکان) بێت. لەم کارەشدا زیاتر جەختی لەسەر نوسراوەکانی (جابری کوڕی حەیان)ی زانای موسڵمان کە لەسەر (کیمیا) نوسیبوونی کردووە، ساڵی ١٩٣٠ لەم کارە دەبێتەوە، بەڵام دەست بەشێواندن وتێکدانی زانستەکەی (جابری کوڕی حەیان) دەکات وبە ئەفسانەیەکی لە قەڵەم دەدات ودەڵێت (ئەو نوسراوانەی خراونەتە پاڵ جابری کوڕی حەیان لە ڕاستیدا نوسراوی فەیلەسوفە ئیسماعیلیەکان بوون و- جابر- هەر هیچ وجوودێکی نەبووە. بەڵکو تەنها ناوێکی دروستکراوی موسڵمانەکانەو بە فەرمان وئیمام وپێشەواکانیان دەربارەیان نوسیوە). جێی باسیشە ناوبراو (دکتۆرای) لە سەر ڕێبازی (ئیسماعیلی)، کە ڕێبازێکی داتاشراوی جولەکەکانە هێناوە، پەیوەندیەکی بەتینی بە ڕۆژهەڵاتناسە جوولەکە توندڕەوەکانی تری وەك (ماسینیۆن)و (جب)و ئەوانی ترەوە هەبووە، جگە لەوەی پەیوەندیەکی ژێر بە ژێریشی لەگەڵ ڕێکخراوە تیرۆریستەکانی جوولەکەدا هەبووە. بەتایبەتی ڕێکخراوی (شتێرن)ی ڕەگەز پەرست وتیرۆریست لەم بارەیەوە نموونەیەکی لەسەر دێنینەوە..، ئەوە بوو ناوبراو ساڵی ١٩٤٤ز دەچێ بۆ شاری قودس، تاکو پشووی هاوینەی تێدا بەسەر ببات، بەڵام دوای ئەوە کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ (میسر) لە سەرەتای ساڵی خوێندن وکرانەوەی قوتابخانەکانەوە وەك کەسێکی زۆر بێ ئارام وراڕا دەبینرێت، هۆی ئەمەش تەنها دوای خۆکوشتنەکەی ڕوون دەبێتەوە کەلە خانە(شقە)یەکی گەڕەکی (زەمالك) لە قاهیرەی پایتەختی میسردا دەژیاو لەوێ خۆی کوشتبوو. ئەویش دوای ئەوەی دوو کەسی تیرۆریست لە جوولەکەکانی نێو میسر (لۆرد مۆین)ی وەزیری جێ نشینی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لەمیسردا دەکوژن دوای ئەوەی پۆلیسیش هەردوو بکوژەکە دەستگیر دەکات، ناونیشانی

(کراوس) لە گیرفانی یەکێکیاندا بەدی دەکەن، کە هەموویان سەربە تاقمە تیرۆریستەکەی (شتێرن)ی زایۆنی بوون. دیارە کراوس سەربشك کرابوو لەوەدا کە، یان بەشداری لەو کارە تیرۆریستیەدا بکات، یاخود لە حاڵەتێکی دەرکەوتنی پیاو کوشتنێك داو ئاشکرا بوونیان لەلایەن دەزگاکانی ئاسایش دەست بەجێ پەنا بباتە بەر خۆکوشتن. دیارە لە هەردوو حاڵەتەکەشدا ئەو هەر کوژراوە.

٥-(بەرناد لویس) ئەمەش دکتۆرای لە ڕێبازی (ئیسماعیلي)دا وەرگرتووەو، سەردانی سوریەو لوبنان و میسری کردووەو پەیوەندیەکی زۆری بە ڕۆژهەڵاتناسە زایۆنیەکان وبزاقە ڕەگەزپەرستیەکانەوە بووەو، یەکێکە لە ڕۆژهەڵاتناسە دیارو هاوچەرخەکان، تەنانەت لە هەمووشیان زیاتر دیراسەو لێکۆڵینەوەی لەسەر ئیسلام وموسڵمانان هەبووە. لە بەریتانیاوە چووە بۆ ئەمریکاو لەچەندین زانکۆو پەیمانگەدا، وانەی لەو بوارانەدا گوتووەتەوە. لەگەڵ ئەوەدا جوولەکەیەکی زایۆنی بووەو زۆر خرۆشاو وکار تێکراویش بووە بە بیروباوەڕی (هرتزل)ی سەرکردەیان.

# کۆنفرانس وکۆبوونەوە و کۆمەڵەکانی "ڕۆژهەڵاتناسیی"

کۆنفـرانس و گـردبوونەوەی ڕۆژهەڵاتناسـان لـە دیارتریـنی هۆیـەکانی ڕێکخسـتن و ئامـرازی تەنسیق و ڕاوێـژی نێوانـیان بـووە، جگـە لەپێکهێـنانی چـەندین کـۆڕو کۆمەڵـەو ڕێکخـراو بـۆ دانـانی نەخشـەو پـلان و بەرنامـەڕێژی کاروباریان..

**لەم ڕووەشەوە چەند نموونەیەك دیاری دەکەین:-**

١-یەکـەمین کۆنگـرەی نەتەوەیی‌یانـەی ڕۆژهەڵاتناسـی، لەسـاڵی (١٨٧٣)دا بەسـتراوە بـەناوی (کۆنگرەي یەکـەمي نێو دەولـەتي بۆ ڕۆژهەڵاتناسي)[٣٧]. ئەم کۆنگرەیە لەشاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا بەستراوەو [٣٨].. دوای ئـەوەش بڕیار دراوە ساڵی جارێك وپاشان هەر دوو ساڵ جارێك، یان سێ ساڵ جارێك کۆنگرەیەك بۆ ئەو مەبەستە ببەسترێت [٣٩].

٢-سـازکردنی چـەندین کـۆڕو دیـدارو کۆنفرانسـی هـەرێمی (ئیقلـیمی) بـۆ پێکگەیشتنی شارەزایان وپسپۆڕانی ئەو بوارە تەرخان دەکران، وەك کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسانی ئەڵمانیا لەشاری (درسیدن) لەساڵی ١٩٤٩ دا بەسترا [٤٠].

٣-سـاڵی (١٧٨٤)یـش کۆمەڵـەی ئاسـیایی (بـەنگال) بەسەرپەرشـتی قـازی (جۆنز)ی سەرۆکی کۆمەڵەکە، کۆبوونەوەی خۆیان بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی، لەسەر ڕۆژهەڵاتناسی وکاری ڕۆژهەڵاتناسـان بەست ونزیکەی (٩٠٠) کەس بەشداریی تێدا کردووە [٤١].

٤-لـە هـەموو کۆنگـرەکاندا چـەندین دەولـەت بـەڕەسمی یـاخود سـەدان

ڕۆژهەڵاتناس بەشداریان کردووە، وەك کۆنگرەی یەکەمی نێودەوڵەتیان، کە (٢٥) دەوڵەت بەشداری تێدا کردووەو، لە کۆنفرانسی (ئۆکسفۆرد)یشدا نزیکەی هەزار زاناو بیریار لە هەشتا دانشگاو شەست ونۆ کۆمەڵەی زانستیەوە بەشداریان تێدا کردووە [٤٢].

٥-کۆمەڵەی ئاسیایی لە ساڵی ١٨٢٢ دا لە پاریس دروست کراوەو پاشان دەیان کۆمەڵەی تری لەو شێوەیە پێك هێنراون [٤٣].

٦-کۆمەڵەی شاهانەی ئاسیایی لە (بەریتانیاو ئیرلەندە) لەساڵی ١٨٢٣ز دامەزرێنراوە [٤٤].

٧-کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتناسی ئەمریکی، لەساڵی (١٨٤٢ز)دا دامەزرێنراوە [٤٥].

٨-کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتناسی (ئەڵمانی) لە ساڵی (١٨٤٥ز) دامەزرێنراوە [٤٦].

٩-کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتی (ڕوسی) لەساڵی (١٨٨٢ز) دامەزرێنراوەو لەوەو پێش، وەك لیژنەیەك دەست بەکار بووە. بێ گومان هەموو ئەم کۆمەڵەو دەستەو ڕێکخراوانە، هەمیشە لەنێو خۆیاندا بانگەوازیان بۆ بەستنی کۆنفرانس و دروستکردنی (تکتلات) کردووەو خوازیاری ئاڵوگۆڕ کردنی بیروڕاو زانیاری بوون [٤٧].

١٠-جێی باسیشە هەر خودی فەرەنسیەکان یەکەم جار لە ساڵی (١٨٨٧)دا، کۆمەڵێکیان بۆ ڕۆژهەڵاتناسانی خۆیان دامەزراندووەو، دواتر لە ساڵی (١٨٢٠)دا بە کۆمەڵەیەکی تریانەوە لکاندوە [٤٨].. دیارە بەریتانیاش بایەخێکی زۆری بە پێکهێنانی ئەم جۆرە کۆمەڵە ڕۆژهەڵاتناسیانە داوەو لە ساڵی ١٨٢٣زدا کۆمیسۆنێکیان بۆ کۆمەك و هاندانی لێکۆڵینەوەی تایبەت بەو بوارە دامەزراندووەو تەنانەت خودی پادشای بەریتانیاش سەرپەرشتیاری بوون [٤٩].

بێگومان چەند وڵاتێکی دیکەی ڕۆژئاواش دەستەو کۆمیسیۆنی لەم

چەشنەیان دامەزراندووەو، حکومەتەکانیشیان ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ سەرپەرشتیی کاروچالاکیو کۆنگرەو دیراسەو لێکۆڵینەوەکانیان بۆ کردوون، نەخاسمە کە بایەخێکی فرەیان بە زمانەکانی گەلانی موسڵمانی ناوچەکە بەتایبەتیش زمانی عەرەبی داوە، هەروەها بایەخیان بە کلتوورو مێژوو چەندین لایەنی گرنگی تری ژیانی ڕۆژهەڵات داوە، ساڵانە ڕاپۆرت و بڵاوکراوەی هەمە جۆریان لەسەر نووسیوەو ناردوویانە بۆ دەزگا پەیوەندیدارەکانی سەر بە حکومەتەکانیان، هەرچەندە زۆربەی ڕاستییەکانیان شێواندووەو بە واقیعی ئاماژەمان بۆ لایەنە ڕاست و دروستەکان نەکردووە.

١١-پاشان ئەم جۆرە دەستەو کۆمەڵانە لە کۆنگرە نێو دەوڵەتییەکانیاندا بەردەوام بوون و ناو بەناو، هەر لە چەند ساڵ جارێکدا ئەڵقەی کۆبونەوەو بیروڕاو زانیارییەکانیان بە زنجیرەی کاری بەردەوامیانەوە گرێ داوە، تەنانەت ساڵی (١٩٨١ز) لە شاری (پاریس)ی فەرەنسا کۆبوونەوەیەك بۆ ئەو مەبەستە بەستراو، ڕێکخراوی (یونسکۆ)ی سەر بەنەتەوەیەکگرتووەکانیش بانگهێشتی بەشدارانی کردبوو و چەندین ڕۆژهەڵاتناسی ناوداری تێدا دەبینران، جگە لە وەفدێکی (ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی)یش، کە وەك میوان بانگ کرابوون..

بێگومان دروست کردنی ئەو هەموو کۆمەڵەو ڕێکخراوە هەمە جۆرانە لە ڕۆژئاواداو، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی کاریڕۆژهەڵاتناسانیان بۆ ئەوە بووە، کە وەك چەند گروپێك پێکەوە بن و لێك دانەبڕێن و زیاتر پەرە بە پیشەو چالاکیو بەرنامەکانیان بدرێت. هەروەها بۆ خولقاندنی جۆرە پێشبڕکێیەکیش، لە نێوان ئەو کۆمەڵو تاقمانەیاندا بە مەبەستی بەدی هێنانی زۆرترین ئامانجی ستراتیژیی ڕۆژئاوا، لە داگیرکارییو هەژموون (هیمنة) لەسەر ڕۆژهەڵات و بەتاڵان بردنی سامان و داهاتیان و چەوساندنەوەی گەلەکانیان..

❋❋❋ ❋❋❋

# ڕۆژهەڵاتناسیی وکوردناسیی

گەلی کورد یەکێکە لەو گەلە دیارو ناسراوانەی ڕۆژهەڵات، کە جێی بایەخی گەڕیدە[1] ڕۆژهەڵاتناسەکان بوون و، لەم بارەیەوە بەسەدان وهەزاران توێژینەوەو کتێبی هەمە جۆریان لەسەر نوسیوە، نەخاسمە چونکە گەلێکی موسڵمان وباوەڕداری ڕەسەنەو ڕۆڵێکی گەورەی لەمێژووی سەروەریەکانی نەتەوەی ئیسلامیدا هەبووە. وشەی (کوردناسیی)ش، کە بەپێویستمان زانی بیکەینە سەرباسی ئەم بڕگەیەی لێکۆڵینەوەکەمان، وشەیەکی بڵاوەو، کراوەتە ناونیشانی چەندین توێژینەوەی پەیوەست بەم باسەوە- دەشتوانین بڵێین ئەم وشەیە بۆیەکەم جار لەساڵی (١٩١٣) لەلاپەڕە (٨)ی ژمارە (٢ی گۆڤاری ڕۆژی کورددا) لە ئەستەمبوڵ لەلایەن (د.عبدالله جودت)ەوە، لە وتاری (اتحاد یولی) بەزمانی (تورکی عوسمانلي) بەکار هاتووە [٥٠].. پاشان لەگۆڤاری (هاوار) لەژمارە (٢٢، ٢٣، ٢٤)دا، لەساڵی (١٩٣٤) لە (دمشق) لەوتارێکی (هێرکۆل ئازیزان)- جەلادەت بدرخان بەناونیشانی (کوردو کوردستان ب چاڤێ بیانیان) بەکار هاتووە. زاراوەی (ڕۆژهەڵاتناسیی)ش بۆ یەکەم جار لەئەدەبیاتی کوردیدا لەلاپەڕە (٢٣٥)ی ژمارە (١٢)ی گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) لە حوزەیرانی (١٩٤٤)دا لەشێوەی ڕۆژهەڵاتیەوان لەلایەن (حسین حوزنی موکریانی)یەوە بەکارهاتووە [٥١].

پاشان لەلایەن مێژوونووسانی هاوچەرخەوە کراوەتە (ڕۆژهەڵاتناس). ئەم زاراوانەی (کوردناسیو ڕۆژهەڵاتناسی) یەش لەساڵانی سییەکانی سەدەی

---

[1] گەڕیدە: گەشتیار

ڕابوردووەوە بەکارهێنراون و، نوسەرانی وەك (د.عبدالله جودت) و(د. کامران بدرخان) و(باباعلي) و(جەلادەت بدرخان) و(حسین حوزنی موکریانی)، لەم بارەیەوە سەرنجی بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناس وگەریدەکانی کوردستانیان داوە. (کوردناسیی) کە بەفەرەنسی (کوردۆلۆژی- Kurdologie)و بەئینگلیزی- (کوردەلەجی- Kurdology) بەئەڵمانی (Kurdenkunde)ی پێ دەگوترێت، بەڕای هەندێك لەنوسەرە ناسیۆنالیستەکانی کورد، بەو (زانستە) دەڵێن، کە گوایە لەهەموو لایەنێکی ژیان وکلتوورو زمان ونیشتمان ومێژووی گەلی کورد دەکۆڵێتەوەو، لەزانکۆکانی (فەرەنسا) و(ئەڵمانیا)و(ئەرمەنستان) و(ئینگلستان) و(سوید) و(ڕوسیا)دا، وەك بەشێکی لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵات بایەخی پێ دراوە، بەڵام (د.جمال نەبەز) لەبارەی (کوردناسیی)یەوە دەڵێت (پێم وایە- کوردناسیی- ناسینی کورد دەگرێتەوە، نەك (زانستی لێکۆڵینەوە لەکوردو بەتایبەتی لەزمانەکەی) کە بە ئینگلیزی (کوردەلەجی)ی پێ ئەڵێن ومنیش ناوم ناوە (کوردەوانتی) [٥٢].

زۆربەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەش کەلەسەر کوردیان نوسیوە، ڕاستیەکانیان بەپێی پێویست وەکو خۆیان نەگەیاندووە، چونکە لەپشت ناساندنی کوردەوە، چەندین نیازی سیاسی ومۆنۆپۆلی وبەرژەوەندی خۆیان هەبووە، جگە لەنیازەکانی بلاوکردنەوەی ئاینی خۆیان وبەمەسیحی کردنی گەلانی خۆرهەلات.. مامۆستا (شوکور مستەفا) دەڵێت: (باری هەندێ سەرنجی ئەم گەڕیدانە لەمەڕ باب وباپیرانمانەوە ڕوون نین و، تێیان ناگەین و، جێی سۆو گومانی دڵشکێنن. ئەوەی کە بتوانین کەمێ دڵی خۆماتی پێ بدەینەوە، بابێ پێژیش بێت، ئەوەیە، کە نەتەوەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتیش هەر یەکە بەشی خۆی بەر ئەم سەرنج وبڕیارە ڕەقانە کەوتووەو، ناتوانێ خۆی لێ ببوێرێت. بەڵام نابێ ئەمە ببێتە هۆی ئەوە، کەخۆمان لەو سەرنج وبڕیارانە نەبان کەین وتێیان نەگەین وپەرچیان نەدەینەوە) [٥٣].

**لەم بەشەی باسەکەشماندا ئاماژە بۆ ناوو بەرهەم وپەگەزی هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەکەین، کە دەربارەی نەتەوەی کوردیان نوسیوە:-**

## یەکەم: ئەڵمانییەکان و کوردناسیی لەئەڵمانیادا:

بێگومان ئەمڕۆ ئەڵمانیا تەنها ئەو چوارچێوە سیاسیە نییە، کە لە کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوودا دەبینرێت، بەڵکو لێرەدا مەبەست لەو وڵاتانەی تریشە کە گەلەکانیان بەزمانی ئەڵمانی دەدوێن، واتە: باسی کوردناسییە لە (نەمسا)و، تا ئەندازەیەکیش لەسویسراو بەشە ئەڵمانیەکەیدا. هەروەها کوردناسیی لەلای ئەڵمانیەکان وئەوروپاییەکانیش، هەموو ئەو هەوڵ چالاکی وکاروبارانە دەگرێتەوە، کە بۆناساندنی کورد بەئەڵمان دراون، سا ئیتر لەڕووی زمانەوانی وئەدەبیاتەوە بووبێ، یا لەبارەی مێژوو سیاسەتەوە، یا لەلایەنی هونەرو کۆمەڵایەتیەوە، یا تەنانەت وتاری پڕ لەدەنگ وباسی درۆ، یا ڕاستی ناو ڕۆژنامەش. هەندێك لەلێکۆڵەرەوان وای بۆ دەچن، کەدووور نییە ئەو گەشتنامە (Reisbuch)یەی کەلەساڵی (١٤٧٣ز)دا لەلایەن زێرینگەری باڤارییەوە (Johann Schiltberger)- (١٢٩٤- ١٤٢٧) بڵاوکراوەتەوە، کۆنترین سەرچاوەیەکی ئەڵمانی بێت، کەناوی کوردی تێدا هێنراوە [٥٤].

هەروەها یەکێك لەسەرچاوە هەرە کۆنەکانی ئەڵمانیاو ئەوروپا، کەلەبارەی کوردو وڵاتەکەیەوە ئەدوێن، ڕاپۆرتێکە بەبۆنەی یەکێك لەجەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە لە ژمارە (٣٨)ی گۆڤاری ( Kriegs bericht turchis Und-Eastats)دا لەلایەن (Thomas von wiering) ناوێکەوە لە (هامبۆرگ) لەمانگی شوباتی (١٨٦٤)دا بڵاوکراوەتەوە [٥٥].

لەسەدەی هەژدەهەمی فەرهەنگیدا، چەند سەرچاوەیەکی دیکەی ئەڵمانیش لەبارەی کوردەوە دواون، یەکێك لەمانە باسی گەشتێکە کە (نیبۆر- ( Niebuhr) ناوێك بۆ وڵاتانی عەرەبی وئەو وڵاتانەی دەرو دراوسێیان

کردوویەتی [٥٦].

نوسەر لەبەشی دووەمی ئەو گەشتنامەیەدا کەلەساڵی (١٧٦٦ز)دا دەرچووە، باسێکی لەسەر کورد نوسیوە. (نیبۆر) کە لەمەڕ بنەچەکەی خەڵکەکە دەدوێت، نەتەوە موسڵمانەکانی سەرلەبەر بەسەر یەکەوە لەقەڵەم داون و، وەك هیچیان لەبارەوە نەزانێت، خۆی لێ نەبان کردوون، هەرچی عیسایییەکانن، کە لەچاو موسڵمانەکان بەکەمایەتی دادەنرێن، زۆر بەئاوو تاوو بەڕەگ وریشەو گێزو کۆڵینگەوە، لەسەر باسکردنیان دەڕوا. خۆجارێ کوردستانی ئێرانی هەر نەدیوە، هیچی لەبارەوە نازانێ و، تاکە وشەیەکی لەسەر نالێ، هەر شتێکیش لەبارەی کوردەکانەوە دەردەست کردبێ، لەقسەی دەماو دەم و سەرزاری وبێ بەڵگەو بێ سەروبەری قەشە ئەوروپایەکان بەولاوە- کە لە (دێر)ێك لە (دێر) ەکانی، (موصل)دا توشیان بووە- هیچی تر نی‌یە [٥٧].

(بێرگ- Bergh) ناوێکیش گەشتێکی بەکوردستان وئەرمەنستان وگورجستان وئەنەدۆڵ وعێراقدا کردووەو، نامیلکەیەکی لەو بارەیەوە نوسیوەو، لەساڵی ١٧٩٩دا بلاوی کردۆتەوەو، چەند وێنەیەك ودوو نەخشەشی لەگەڵدا داناوە.

هەروا جگە لەچەندین ڕۆژهەڵاتناسیی بەرەگەز ئەڵمانی وەك (ویسباخ) و(ڕیناخ) و(کارل مای) و(فۆن هەمەر) و(فۆن کلاپرۆس)ی نەمسایی و(بلۆ) و(سترێکر) و(ڤامبەري) و(بێکەر) و(پاچستین) و(ڤۆنش) و(بورخارد) و(ئەدوارد سەخاو) و(خاولەر) و(مۆریتز فاگنەر) و(بارۆن فۆن نۆڵدە) و(فریدریك فۆن بۆدن شێت) و(فریدریك میوللەر)ی نەمسایی و(باربری نەمسایی) و(شلێفل) و(هۆتۆم شیندلەر) و(ئەلبێرت سۆسین- ی سویسرایی) و(ڤۆن لۆخمان) و(بۆتیکا) و(سێپ) و(ڤۆن ستێنین) و(شترێك سترێخ) و(تیۆدۆر نوێلدەکە) و(کیپێرت) [٥٨]. هەروا دەیان نوسەرو چیرۆك نووس ویادداشت نووس

وپرۆفیسۆری زانکۆ، کەهەموویان لەخزمەتی تەواوکردنی پرۆسەی ڕۆژهەڵاتناسیی وزانستی بەناو (کوردۆلۆجی) دابوون. لەساڵانی کۆتایی سەدەی نۆزدەوە تاجەنگی‌یەکەمی جیهانیش، چەند ڕۆژهەڵاتناسێکی تری ئەڵمان وەك پرۆفیسۆر (ئۆسکارمان)وپرۆفیسۆر(ڤۆن لکۆك)و(ئاوگۆست پیتەرمان)و(مارتین هارتمان)ڕوویان کردۆتە کوردستان ویاداشتی خۆیان نووسیوەو، ژمارەیەك دەستنوسی کوردی و سەر بە کوردیشیان لەکوردستان وڕۆژهەڵاتی ناوەراست دا کۆکردۆتەوەو بردوویانە بۆ ئەڵمانیا. هەندێك لەودەستنوسەبەنرخانە ئێستا لە کوردستان دا نەماون، کەچی لەکتێبخانەکانی (بەرلین)و (توبنجین)و (ماربۆرگ)دا چنگ دەکەون [٥٩].

بەریتانیا بێگومان بەچاوگێڕانێکی خێرا تەنها بەناوی ڕۆژهەڵاتناسانی ئەڵمانی‌و بەرەگەز ئەڵمانی، وەك نەمسایی‌و سویسرایی‌یەکاندا،دەردەکەوێت، کە ڕۆژهەڵاتناسانی ئەڵمان زۆرترین پشکی چالاکییان لەم بوارەدا هەبووە و، دەیان وسەدان توێژینەوەو یاداشتنامەیان نووسیوە، بەڵام بەداخەوە زۆربەیان بە ڕاشکاویی‌و بێشەرمانە، ڕاستی‌یەکانیان شێواندووە. بۆنموونە، دەیان وسەدان نووسەرو پرۆفیسۆری وەك(ڤۆن بیخستید) و(ڤۆگەڵ)و(هانس تیما)و (فاولەر)و (ڤاگنەر)و (بارۆن نۆلدە)، گەلی کوردیان بەدزو جەردەو خوێنڕێژو پیاوکوژ داوەتە قەڵەم [٦٠].

## دووەم: کوردناسیی لەبەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسانی ئیتالیایی‌دا

ژنە نوسەری ئیتالیایی، خاتوو (میریلاگالیتی)، سەرەتای مێژووی ڕۆژهەڵاتناسیی ئیتالی لەوڵاتی کوردان دا، بۆ ساڵی (١٢٠٠ز) دەگێڕێتەوەو، وای دادەنێت کە تا ساڵی (١٨٠٠ز) بەردەوام بووەو، پاشان تا سەدەی بیستەمیش چەند یادداشتێکی تر نوسراونەتەوە [٦١].

دیارترین هۆی پاڵنەری ئیتالی‌یەکان لەچەند مەسەلەیەکی سیاسی وبازرگانی‌و ئایینی‌یەوە، دەشێت بڵێین، لەڕۆژگاری جەنگی خاچپەرستییشەوە سەری هەڵداوە. مامۆستا شوکور مستەفا دەڵێت: (سەرەتای پێوەندیی نێوان ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوا، لەگەڵ شەڕو شۆڕی خاچپارێزەکاندا دەستی پێ کرد. لە هەرەت وجەنگی شەڕو شۆڕێکی خوێناویی دوورو درێژی خاچپارێزەکاندا، کە چەك وشارستانێتی وئایین (مەسیحیەت لەدژی ئیسلام)و کەلەپوور پێکدا هەڵدەپژان و، زۆرانیان دەگرت و، دەرفەتی هیچ جۆرە لێك هەڵەنگوتن ولێك گەیشتن وبازرگانی‌یەك نەبوو. ئەورووپای مەسیحی ودەرەبەگ، خاکی‌فەلەستینی پیرۆز و سوریایان لە موسڵمانان دەویست) [٦٢].

یەکەمین کتێب لەبارەی زمانی کوردی‌یەوە چاپ کرابێت، لەلایەن یەکێك لەو موژدەهێنانەوە نووسراوە: لەلایەن قەشەی ئیتالی (گارزۆنی/ Morizio Garzoi) کە لەساڵی (١٧٨٧) بەناونیشانی ( Gramatica Vocabulairio dell Lingua Kurda)- لەڕۆما چاپ کراوە. قەشەی ناوبراو کە سەرۆکی وەفدێکی موژدەهێنان بوو لەساڵی (١٧٦٢ز)دا دەگاتە موسڵ، ئینجا دوو ساڵ درەنگتر لەگەڵ وەفدەکە دەچنە ئامێدی‌و، تا ساڵی (١٧٧٠ز) لەوێ دەمێننەوە. پاشان (گارزۆنی) لە (١٧٨٣) دا دەگەڕێتەوە (ڕۆما) وساڵی (١٧٩٠ز) کۆچی دوایی دەکات [٦٣].

ڕۆژهەڵاتناسێکی بەناوبانگی دیکەی ئیتالی، (دێلاڤالی) لەسەدەی حەڤدەدا دەربارەی کوردانی نووسیوەو، بەچەند هۆزێکی نیشتەجێی لەقەڵەم داون. ناوبراو لەساڵی (١٦١٧)دا گوتوویەتی (زۆربەی کوردی گوندو شاران نیشتەجێن). بەڵام ئەوەی زۆر ئاساییەو جێی کێشە نی‌یە، کوردی نیشتەجێ لەو مێژووە بەپاشەوە، ڕوو لەزیاد بوون و ڕەوەندەکانیان ڕوو لەکەم بوونەوەن.

سەرێکی دیکەی تایبەتی ئەم لیستە ئەوەیە، کە ناوی هیچ هۆزو عەشیرەتێکی کوردی کوردستانی ئێران وعێراقی نەگرتۆتەوە [٦٤].

جگە لەمانەش چەندان ڕۆژهەڵاتناسیی تری ئیتالی وەك (ژۆزێپێ کامپانیل)و (ئەلیساندرۆدی بیانکی) و(ڕیکۆلدو مۆنتیکرۆشی) و(مارین سانورو تورسیلو) و(لیگرێنزی) و(کاریری) و(مینی) و(دی فیکی) و(ئۆسکۆلاتی)و [٦٥] ... هتد لەسەر کوردیان نووسیوە.

## سێیەم: کوردناسیی لە ڕوسیا و یەکێتی سۆڤیەتی جاران دا

(د. کەمال مەزهەر) دەڵێت (لە دەمێکەوە کوردناسی بووەتە لقێکی دیاری ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤیەت. ژمارەیەك لە ڕۆژهەڵاتناسە ناودارەکانی ڕووسیا، بەر لەشۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩١٧) بەماوەیەکی زۆر، بناغەی کوردناسییان داڕشت. وا ڕێك کەوت بەشێك لەدەستەی دووەمی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە، ببنە هاوچەرخی دوو ڕۆژگارو دوو ڕژێمی جیاواز- سەردەمی ڕوسیای پێش ئۆکتۆبەرو، سەردەمی سۆڤیەتستانی پاش ئۆکتۆبەر- [٦٦].

(ناسینی کوردو.زمانەکەی، بۆیەکەم جار بۆ نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم. واتە بۆ ئەو دەمەی کە ئەکادیمیەی زانستی ڕوسی (فەرهەنگی بەراوردی هەموو زمان وشێوەکان)ی لەچاپ دا دەگەڕێتەوە. ئەم فەرهەنگە کە لەساڵی (١٧٨١) دا بڵاوکراوەتەوە، (٢٧٣) ووشەی بە(٢٠٠) زمان، کە کوردیش یەکێکیانە، تێدا تۆمار کراوە [٦٧].

هەروەها لەکۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، هەندێك وتارو نامیلکە لەبارەی پەیدابوون وژمارەو نەریتی کوردەوە بڵاوکراونەوە، بەتایبەتی هەندێك زانیاری لەبابەت خێڵە کۆچەرەکانی پشت قەفقاسەوە، کە لەهەندێ ڕاپۆرتی سەرژمێریی وچاپەمەنی فەرمانڕەواییدا بەرچاودەکەن. بێگومان ئەو

وتارو ناميلكانه بەشێوەيەكی ساكارو كورت وكۆڵن. بەم جۆرە دەبينين، كە تاكۆتايی نيوەی يەكەمی سەدەی نۆزدەهەم، لەڕوسياى قەيسەری لەبارەی زمان و مێژووی ئەتنۆگرافيای كوردەوە، هيچ نووسراوێكی وەها گرنگ وزانستی نەبووە (٦٨).

(ديارترينی ڕۆژهەڵاتناسانی ڕوس، كە بايەخيان بەكورد داوە، (پ. لێرخ)ە، كە لە نيوەی سەدەی نۆزدەوە دەستی بەلێكۆڵينەوەی نەتەوەی كوردو زمانی كوردی كرد. ئەو كابرايە لەساڵی (١٨٢٨ز) لەدايك بووە، لەساڵی (١٨٥١ ز)دا خوێندنی خۆی لەزانينگای (پێشێر بۆرگ)دا تەواو كردووەو، ناوی پێشەگزانی زمانانی ڕۆژهەڵاتی وەرگرت) (٦٩).

جێی باسە (لێرخ) سێ كتێبی لەبارەی كوردەكانی ئێرانەوە نووسيوەو، لێكۆڵينەوەكانيشی لەساڵی (١٨٥٠)ەوە دەست پێ كردووە. وەك (د.قەناتی كوردۆ)ش دەڵێت: (لێرخ- لەناو ساڵانی (١٨٥٨- ١٨٦٠)دا لە ئەكاديمیای ڕووسيا كاری دەكرد، لەو سەردەمەدا دەبێت بەهاوكاری (ئێكسپێديسی/ ن.پ. ئێگناتۆڤ)و لەگەڵی دەچێت بۆ- (بوخارا- و-- خيو- و ئۆرينبۆرگ). لەم ئێكسپێديسیيەدا، مەبەستی ئەو لێكۆڵينەوەی مێژوو، ئەتنۆگرافیو زمانی دانيشتوانی ئەو هەرێمانە بوو. هەروەها مەبەستی ئەوەش بوو، كە شت ومەك وەدەست نووسەكانی خەڵكی ڕۆژهەڵات كۆبكاتەوە) (٧٠).

(گەڕيدەيەكی كوردناسی ديكەی ڕوس (گەردلێڤسكی)يە (١٨٧٦- ١٩٥٦) كە باب وباپيريشی لە ئەفسەرانی لەشكری چارو، سەر بەدەستەی خوێندەواری ڕۆژگاری خۆيان بوون. (ڤلاديمير ئەليگسەندەر ڤيچ گەردلێڤسكی) سەرەتا بەزانستی توركناسيی دەستی پێكرد، بەڵام خۆی لەقاوغی توركناسیدا نەبەستەوە، بەڵكو بايەخێكی زۆريشی بەلێكۆڵينەوەی لەخاك ونيشتمانی كورد داوەو، زانياريەكی زۆری لەم بارەيەوە بۆ سوپاو

سەرلەشکرەکانی ڕوس کۆکردۆتەوە. ئەو زیاتر چەق دەخاتە سەر سەلجوقییەکان وچۆنیەتی داگیرکردنی کوردستان. هەروەها بەشێکی لێکۆڵینەوەکانیشی بۆ ژیان وداب ونەریتی(قزلباشەکان)ی- ئاسیای بچووك- تەرخان کردووەو، ساڵی (١٩٢٢) توێژینەوەیەکی لەسەر بڵاوکردۆتەوە) [٧١].

کوردناسێکی تری ڕوس (ئەلیکساندەر ژاپا)- (١٨٠٣- ١٨٩٤) کە بەبنەچە (پۆلۆنی) وبەزمان (فەرەنسی) و(٤٤) دەسنووسی پەخشان وچیرۆك وزمانەوانی ومێژووی کوردەواری- بەزمانی کوردی- کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراون لەبەردەستدا بووە. ڕاستییەکەشی بەرهەمەکانی (ژاپا)، کە بەشی هەرە زۆریان بەهاوکاری- مەلا مەحمودی بایەزیدی (١٧٩٩- ١٨٦٠) ئەنجام دراون، سێ چارەکی ئەدەبیاتی پەخشانی کوردیی سەدەی نۆزدەهەم پێك دەهێنن [٧٢].

ڕۆژهەڵاتناسیی ناوداریش (پ.م. ڕۆدنکۆ)و، ڕۆژهەڵاتناسێکی دیکەی ڕوسیش (چیخاچێڤ)، ستایشی ڕۆڵی (ژاپا)یان کردووە لەوەدا، کە سەرکەوتوانە خەریکی زمانی میللەتێکی وەکو کورد بووە، کە بەڕای خۆیان هێندە کەم ناسراوەو هێندەش دێرینە- هەروەها چەندین ڕۆژهەڵاتناسیی تری ڕوسی [٧٣] وەك ( ڤ- دیتیل) و (خ- ئابۆڤیان) و (ی- بیریزین) و (ڤ. ڤ. ڤیلیا منیۆ ڤ) و (فێردیناند یوستی) و(س. ئا- یەگیزارۆ ڤ) و (ن.یا- مارر)و،. هتد.

دەربارەی (کوردناسی)یش لە (یەکێتی سۆڤیەتی جاران)ی دوای (ڕوسیای قەیسەری)، چەندین ڕۆژهەڵاتناس لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر بایەخیان بەم لایەنە داوەو لەسەری بەردەوام بوون و چوار مەڵبەندی کوردناسییان لە یەکێتی سۆڤیەتی ئەوسادا دامەزراندبوو، کە لە شارەکانی (مۆسکۆو یەریڤان وباکۆو

لێنینگراد)دا بوون و، کاروباری ئەم مەڵبەندانەش بەتەواوەتی پێکەوە بەستڕا بوو و، هەنگاوی هەر مەڵبەندێکیان بەبەشداری وهاوکاری ئەوانی تر بووە [٧٤].

(د.م.س. لازاریێڤ) دەڵێت: (لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا، ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات و ئێران، دەورێکی گەورەیان لەسیاسەتی ڕوسیای قەیسەری دا هەبوو، دۆخی هەڵوێستی ناوەوەی ئازربایجان وئێران وکوردستان وئەرمینیا وتورکیا بەلای-ڕوسیاوە- بۆپاراستنی سنوورەکانی زۆر گرنگ بوون. ئەمە دۆخی ویلایەتی قەفقازیشی گرتەوە، چونکە دانیشتوانەکانی وەك دانیشتوانی ناوچەکانی سەرسنووری تورکیا و ئێران تێکەڵاو بوون، واتە (کوردو تورك وئەرمەنیان تێدا بوو). هەر لە بەر ئەمەشە ئەبینین بۆچي ڕوسیا گوێی دابووە مەسەلەی کورد وئەو مەسەلەیەی بەلاوە گرنگ بوو. ئەمەش بەتایبەتی لە ساڵی (١٨٩٠)وە ڕووی‌دا، کاتێك ئاشوب و شەڕو هەرا لە کوردستان وئەرمینیای تورکیا دەستی پێ کردو، ژمارەیەکی زۆری کوردەکان ڕێکخراوی جەنگی‌ی خۆیان پێکهینا. مەسەلەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا لە مەیدانی سیاسەتی چەند دەوڵەتێکی مەزنی تریشدا شتێکی کەم نەبوو)[٧٥]. کەوابوو ڕوسەکان چ لە ڕۆژگاری قەڵەم ڕەویی قەیسەری و چ لە ڕۆژگاری دامەزراندنی یەکێتی سۆڤیەت وبە زۆر پێوە لکاندنی چەندین وڵات و هەرێمی تریشدا، ئاتاجێکی زۆریان بە ڕۆژهەڵاتناسان و زانستەکانی کوردناسیی و تورکناسیی و ئێرانناسیی هەبوو.

## چوارەم: کوردناسیی و ڕۆژهەڵاتناسانی فەرەنسا

لەڕۆژهەڵاتناسانی فەرەنسەیی (جین- یان- ژان-پاپتیست تاڤیرنەر( Jeun Baptiste Tavernie) (١٦٠٥- ١٦٨٩) کە بازرگانێك بووەو هاوسەردەمی (لویس- ی چواردەهەم) بووەو نەخشەی جوغرافیایی و کاڵاو قوماش و بەردی بەنرخی دەفرۆشت. لەسەدەی حەڤدەهەمدا بەدرێژایی چەند

ساڵ سەفەرێکی زۆری بۆ تورکیاو ئێران وهیندستان کردووەو، ساڵی (١٨٦٨) کاتێك گەڕاوەتەوە بۆ فەرەنسا، زۆر دەوڵەمەند بووەو (لویس- ی چواردەهەم)یش نیشانی خانەدانێتی ی پێ بەخشیوە [٧٦].

لەدووەمین وپێنجەمین سەفەریدا بەنێوجەرگەی کوردستاندا تێپەڕیوەو، باسی ژیان وشێوەی ژیانی کوردەکانی کردووە [٧٧]. هەروەها (گریگۆری پالاماس- Gregoire Palamas) لەساڵی (١٢٦٩) لە (ئەستەنبوڵ) لەدایك دەبێت و، ساڵی (١٣٣٥)لەلایەن تورکەکانەوە لە (ئەنادۆڵ) دەس بەسەر دەکرێت وساڵی (١٣٥٩)دەمرێت.

جگە لەمانەش دەیان ڕۆژهەڵاتناسیی تر، وەك (کلۆد بیلیڤیر) و(ژاگ گاسووت)و (ژان شیسنۆ) و(فیلیپ دوفرینس کانای) و(پێیر ژووپیرت) و(تۆمابوا) و(ڕۆژەلیسکۆ) و(پووڵ) و(ژان دی ئێڤینۆت) وهاوڕێکانیان، سەفەری کوردستان وهەرێمە جۆربەجۆرەکانیان کردووەو، سەفەرنامە و ڕاپۆرت و لێکۆڵینەوەی خۆیان لەسەر گەلی کوردو هۆزو تیرەکان نووسیوە.

## پێنجەم: بەریتانیاو کوردناسیی

ڕۆژهەڵاتناسانی ئینگلیزیش بایەخێکی زۆریان بەکوردو خاکی کوردستان داوەو، چەندین کاری سەخت وئاڵۆزیان بۆ داگیرکەرانی ئینگلیز ئاسان کردووە.. لەم ڕووەشەوە سەدان ناوی وەك (میجەر نۆئیل)و (میستەر هیمفەر) و (میجەر سۆن) و(ئەدمۆنز) و(میستەر ڕیچ) و(جیمس مۆریێ) بەرچاو دەکەن. نووسەران ومێژوونووسان و وەرگێڕە کوردەکان، لەباسی کارەکانی زۆربەی ئەم ڕۆژهەڵاتناسانەدا نەیانتووانیوە لەو ڕاستی‌یە تاڵە قوتار بن، کە چاو لەنیازە بنچینەییەکانی ڕۆژهەڵاتناسانی بیانی بپۆشن، کە بۆ مەبەستەکانی تەبشیرو داگیرکردن وبەرژەوەندی‌یە تایبەتیەکانی ڕۆژئاوا هاتوون. هەردوو وەرگێڕی کوردیی کتێبی (یاداشتەکانی میجەر نۆئیل لەکوردستان)، لەپێشەکی‌یەکی

خۆیاندا دەڵێن (نە- میجەر نۆئیل- دۆستێکی دڵسۆزی کورد بووەو نە کوردیش ئەوەندەی بەدەسەڵات وسامدار بووە، هەتا "نۆئیل" خونکی یان بۆ بکات).. هەروەها لە دێرە کانی سەرەتای پێشەکییەکەیاندا، دەڵێن (ناوچەکە لەدێرین زەمانەوە، گەلی هێزو دەسەڵاتی هەمەجۆری وەك تورك وڕۆم وعەجەم تەماعیان تێ کردووەو، مرخیان لەسامان وخاك وئاوی خۆش کردووە، هەتا ئێستەیش ئەو دەم تێژەندنە هەر بەردەوامە) (٧٨).

دیارترین هۆکارو ئامانجی هەر یەکە لە ڕۆژهەڵاتناسیی وئەوەی بە (کوردناسی)یش ناوبراوە، پەرەپێدانی دین وکەلتووری خۆرئاواو داگیرکردنی شوێنە ستراتیژیەکانی کوردستان و، ناوچە موسڵمان نشینەکانی تری ڕۆژهەڵات بووە.. (د. مجید حمید عارف) دەڵێت: (ژمارەیەکی زۆر لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئۆزبەکستان، قیرغیزیا وتورکمانستان وتاجیکستان وکازاغستان وقەفقازو ئازربایجان وئەرمینیاو جۆرجیاو داغستان وئیستۆنیاو کەبەردین وبولغاریاو شوێنانی تریشی، کەوتە ژێر دەسەڵاتی سیاسي ڕووسیای قەیسەریو دواتر یەکێتی سۆڤیەتی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩١٧) (٧٩).

(میریلاگالیتی)ی ڕۆژهەڵاتناسیی (ئیتالی)، لە دان پێدانانێکی ئاشکرادا دەڵێت: (موژدەهێنەکان تاقمێکی دیارو بەهێزی ڕۆژئاوان و، بەنیازی بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی هاتوونەتە کوردستان) (٨٠).

شوێنی ستراتیژی کوردستانیش، هۆیەکی تری توێژینەوەکانی کوردناسی بووە، وەك (د.فەرهاد پیربال)یش دەڵێت: (بۆ ڕوون کردنەوەی بایەخی ستراتیژی سیاسی کوردستان، هۆی نزیك بوونەوەی ڕووسیا لە کوردو ئەزموونی کوردناسیی لەڕوسیا بەنموونە دەهێنینەوە (٨١).. (ڕوسیا مەبەستی زۆری سیاسی وکەمی ئایینی لە ڕۆژهەڵاتناسیی و کوردناسیدا هەبووە.

لەساڵی (١٧٠٣)دا لەگەڵ بنیادنانی ڕوسیای تازە (سانت پتر سپۆرگ) قۆناغی دەسەڵاتی ڕوسیا دەستی پێکرد، ئەمە بووە هۆی ئەوەی بیری ئیمپریالیزمی کلاسیکی لەڕوسیا بکەوێتە ڕوو. فراوانی خاکی ڕوسیاو هاوسێکانی لەهەموو ڕوویەکەوە بووە هۆی ئەوەی، کە ڕوسیا وڵات وخاکی دراوسێکانی داگیر بکات و بیانخاتە سەر خاکی ڕوسیا، بێ ئەوەی پێویستی بەوە هەبێت و، وەك ئیمپریالیستەکانی بەریتانیاو فەرەنسە وئیتالیاو هیتر، لەزەوی ئەودیوی زەریاکان بگەڕێت. بایەخ دانی ڕوسیا بە ڕۆژهەڵاتناسیی، لەلایەك لاسایی کردنەوەی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بوو، لەلایەکی تریشەوە شارەزایی پەیداکردن بوو، لەنەتەوە هاوسێکانی خۆی لەپێناو بەرژەوەندی دەوڵەت وئاسایشی نەتەوایەتی ئەو سەردەمە. نزیك بوونەوەی ڕوسیا لەکەنداوی (بەسرە)، هیواو ئامانجێکی دێرینی (ڕوس) بوو، بۆ دەستخستنی ئەم ئامانجە. دەبوو قەفقاز داگیر بکرێت. وڵاتی کوردەواریش پردێك بوو، بەبێ ئەوە ئامانجەکە نەدەهاتە دی. جگە لەوە بەشێك لەدانیشتوانی ئیمپراتۆریەت لەڕوسیای کۆن وسەردەمی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان کورد بوون. خاکەکەیان نێوەندێکی ستراتیژی بوو بۆ پاراستنی سنووری خوارووی ڕوسیا) (٨٢).

جگە لەمانەش چەندین ئامانج وهۆکاری ئابووری وفەرهەنگی وهونەری وشوێنەوارناسیی، لەپشت سیاسەتی ڕۆژهەڵاتناسیی و کوردناسییەوە بوون.

❁❁❁ ❁❁❁

# ڕۆژهەڵاتناسیی و مرۆڤناسیی

سەرەتای سەر هەڵدانی زانستی مرۆڤناسی (ئەنسرۆپۆلۆژیا)،بۆ سەدەی هەژدەهەم دەگەڕێتەوە، کە لەو سەدەیەو سەدەی نۆزدەش دا، ڕۆژهەڵاتناسە فەرەنسییەکان دەستیان بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی بەشەری و سروشتی ڕژێمە کۆمەڵایەتییەکانیش کرد. پوختەی گرنگی پێدانیشیان لە کرۆکی کۆمەڵ دا ڕەنگی دەدایەوە بێ ئەوەی مێژوویەکی گۆڕانکاریی کۆمەڵ دیاری بکەن، کە هاوشانی ئەو لێکۆڵینەوانە بێت. ڕوالەتی (ئەنسرۆپۆلۆژیا) لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ بوو، بەڵام لە چەند لایەنێکەوە بوو، نەك لە هەموو لایەنێکەوە. چونکە تائەمڕۆ هیچ زانستێکی گشتگیریی بە تەنها نەیتوانیوە لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە لە سەر مرۆڤ بخاتە ڕوو، هەر چەندە هەندێك لە پسپۆڕانی مرۆڤناسیي لەو بڕوایەدان گوایە ئەم زانستە لە توانایدایە هەموو گۆشە وکەنارێکی ژیانی مرۆڤ بگرێتەوە. لە ڕاستیشدا دەشێت بڵێین، مرۆڤناسە کۆمەڵایەتییەکان بایەخی تەواویان لە توێژینەوەی لایەنی کۆمەڵایەتی ژینی مرۆڤدا تەرخان کردووە، واتە چەق خراوەتە سەر پەیوەندییەکانی مرۆڤ بەخەڵکی تری نێو ئەوکۆمەڵ وژینگەیەی تێیدا دەژی. دەنا زۆربەی ڕەهەندەکانی تری ژیانی مرۆڤایەتی، بەتایبەتیش لەکۆمەڵگە ئاڵۆزو بەڕواڵەت پێشکەوتووەکاندا، بۆ مێژوونووسان وئابووری ناسان وسیاسەتمەداران وکۆمەڵناسان و...هتد بەجێ هێڵراون.

بەهەرحاڵ ئەرکی (زانستی مرۆڤناسیی)، یارمەتی دانی خەڵکی خۆیان، لەپرۆسەی تێگەیشتن لە(خود) لەڕێی لێکدانەوەی کلتووریی گەلانەوە بووە. یەکەم جار چاوگی توێژینەوەکان نووسراو و لێکۆڵینەوەو ڕاپۆرتەکانی

موژدەهێنان ونێردە تەبشیری‌یەکان ونەسرانی‌یەکان و گەشتنامەی ئگەڕیدەکانی سەدەی حەڤدەو هەژدە بووە، کە دەربارەی ئەفریقاو ئاسیاو ناوچەکانی ئۆقیانووسی ئارام، تەنانەت کە دەربارەی ناوچەی ئەمریکای باشووریش نووسیبوویانن.

ئەو توێژینەوانە نۆبەرەی کارەکانی نووسەرانی خۆرئاوا بوون لەبواری-مرۆڤناسیی- دا لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا. بەر لەو مێژووەش تەنها چەند هەوڵێکی هەڵسەنگاندن وبەدواداچوون لەسەر سیستمە مرۆییەکان لەئارادا بووە، کەئەوە بوو لەسەرەتای سەدەی هەژدەدا کەسانی وەك: (هیۆم) و (ئادەم سمیس) و(فیرجوسۆن) لەبەریتانیاو، (مۆنتسیکۆ) و(کۆندارێکت) وهاوشێوەکانی تریان لەفەرەنساو وڵاتانی تری ئەوروپا، لەم ڕووەوە چەند بابەتێکیان نووسیوە.

بەڵام تیڕوانینی ئەم بیریارانە لەچەند ئاماژەیەکی گومان لیٚ کراودا، نەك لەسەر چەند (ڕاستی‌یەکی گەواهی بەخش) بەند بوو. دیدو بۆچوونی ئەوان تەنها دەرەنجامی چەند ڕێسایەکی کلتووریی خۆیان بووە، ئەوان بەرلەوەی بە (زانایانی مرۆڤناسی) بناسێنرێن، چەند فەیلەسووف ومێژوونووسێك بوون، کە لەئەوروپاوە هاتبوون. واتە لەزانایانی مرۆڤناسی نەبوون بەو مانا باو و ناسێنراوەی زاراوەکەی ئەمڕۆیان، بیریارانی فەرەنسایی وای بۆدەچوون کە مادام کۆمەڵگاکان لەچەند ڕژێمێك بن، ئەوا دەبێت لەبەشێکی کارلێکراوی یەکدییش پێك هاتبن. بەڕای ئەوان مەسەلەیەکی پێویست بووە کەوا ئەو بەشانەی کۆمەڵگە پێوەندیان پێکەوە هەبێت، تاکو لەگەڵ کۆمەڵ بووندا یەکەیەکی تەواو کراو بوون. هەر چۆنێك بێت زانایانی ئەنسرۆپۆلۆژیی بایەخی تەواویان بەلایەنی هەڵس وکەوتی کۆمەڵایەتیی مرۆڤەکان داوە. لێکۆڵینەوەی تازەش لەم زانستەدا، بایەخی زیاتری بەلایەنی ئەزموونگەریی ودیاری کردنی

فەرمان وحوکمی هەر شتێك لەکۆمەڵدا داوە. تەوەرەی بایەخەکەش توێژینەوەی پێوەندیەکانی نێوان کەرتە لێك جیاوازەکانی خەڵکی‌یە.

هەندێکی تریش لە ڕۆژهەڵاتناسان بایەخیان بەژیانی ڕابردووی سەرکردەکانی ڕۆژهەڵات و گۆڕستانەکانیان داوە.. تەنانەت لەچەندین گۆڕ و ئێسکەبەندیان کۆڵیوەتەوە. وەك (د.مجید حمید)یش دەڵێت: (گۆڕەکان دوای تەواوبوونی توێژینەوەکانی- ئەنسرۆپۆلۆژیی) لەسەر ئێسکەبەندەکان، داخرانەوەو شێوەی شاردنەوەکەیان وەك خۆی لێکرایەوە. لەبارەی هەر گۆڕێکیش کۆنووسێك لەبارەی کردنەوەی گۆڕەکانْ بەچوار زمانی- ئۆزبەکی وڕوسی و فارسی و ئینگلیزی- ئامادە کرا) (٨٣).

لێرەشدا مەبەستی لەو نێردە زانستی‌یە تایبەتەیە کە ساڵی (١٩٤١) لەبارەی گۆڕی تەیمووری لەنگ وکوڕەکەی(شاهروخ) و(میرانشا) وهەردوو نەوەکەی (محمد سوڵتان) و(ئۆلغ بەگ) چەند زانیاری‌یەکیان دەردەست کردبوو، زانای ئەنسرۆپۆلۆژیی سۆڤیەتی‌ی بەناوبانگ (م.م. جیرا سیموڤ) (٨٤)، وێنەی تەیمووری لەنگ وکوڕو نەوەکانی بەپێ‌ی توێژینەوەی کەللە سەرو تەرمەکانیان دیاری کرد.

لەسەر ئاقارێکی بەرزتریش، هەندێك بایەخی دیکەی ڕۆژهەڵاتناسان لەسەر تەکنیککاریی پێوەندیی مرۆڤەکاندا چڕ کراوەتەوەو، لەسەر توێژینەوەی هەر یەکە لە هەڵوێست وپێوەندی‌یەکان ئاڕاستە کراوە. دیارە ناشێت ڕۆڵی ئەم زانستە لەهاندانی لێکۆڵینەوەی قووڵتر و بەدواداچوونی پتردا فەرامۆش بکەین، چونکە چەند زانایەك بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی هەندێك گرفتی عەمەلی بەمەبەستی چارەسەرکردنیان، لەدەرەوەی هۆڵەکانی وانەبێژی (محاضرات)ەوە هاتنە مەیدانەوە. لەم دواییەشدا، چ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و، چ

حکومەتەکانی کۆمەنۆیلسی بەریتانی و، چ حکومەتی ئەمریکاو چەندین حکومەتی دیکەی خۆرئاوایی، سوودێکی زۆریان لەکارو بەرهەمی پسپۆرانی مرۆڤناسیی وەرگرتووەو، لەڕێگای جیاجیاوە زانایانی مرۆڤناسیی و کۆمەڵناسیی و پسپۆرانی تری زانستە مرۆییەکانیان، وەك چەند فەرمانبەرێکی هەمیشەیی دامەزراندووە و خستوویاننەتە گەڕ، بەم پێیەش پسپۆڕانی مرۆڤناسی بوونە چەند فەرمانبەرێکی گشتی.

لەئەوروپادا چەمکی زاراوەی (مرۆڤناسیی)، لەگەڵ چەمکی زاراوەی (پێشکەوتنناسیی مرۆڤ) هاوڕێکە و ئەمەی دوایش لەوێ زانستێکە بۆ لێکۆڵینەوە لەمرۆڤ، وەك بونیادێکی ئۆرگانیی.

# مرۆڤناسیی و وێناکردنی ڕووخسار

ڕۆژهەڵاتناسانی مرۆڤناس (واتە زانای خۆرئاوای پسپۆڕ لە کاروباری گەلانی ڕۆژهەڵات و داب و نەریتیاندا) بەشداریەکی زۆریان هەبووە لە وێناکردنی روخساری مرۆڤی ڕۆژهەڵاتدا (٨٥). لە زەمەنی ناوبراو بە سەردەمی -ئیمپریالیزم- یش دا، ڕۆژهەڵات لە عەقلی ڕۆژئاوایەکاندا لە وێنەیەکی فراوانترێدا دروست ببوو... لای ئەوان مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی وەك (ادوارد سعید) گوتەنی (الشـرقي ليس بالمنطقي، أنهُ منحل أو طفولي و مختلف عنا ...الخ)،: (کابرای ڕۆژهەڵاتی مەنتیقی نییە، بەڵکو بەرەڵاو مشەخۆر و لەئێمە جیاوازە... هتد.) هاوزەمان لەگەڵ پەل هاویشتنی زیاتری ئیمپریالیزمدا، توێژینەوەی زیاتر لەسەر کۆمەڵگە بەشەرییەکانی ڕۆژهەڵات بڵاودەکرایەوە. بۆ نموونە: (ناپلیۆن پۆناپارت) لەشاڵاوەکەیدا بۆسەر (میسر)- ١٥٠ - زانای لەگەڵدا بوو، کەشارەزای چەند بوارێکی هەمە جۆر بوون و، چەند لێکۆڵینەوەیەکی کلتووریان لەبەردەستدا بوو، ئەو پێگەیشتنەی (ئەوروپای پێشڕەوی ئیمپریالیزم) و(ئاسیاو ئەفریقای داگیرکراو) بەردی بناغە بوو، لەڕێساکانی لێکۆڵینەوەی کلتووری کۆمەڵگەکانی هەریەکە لەو دوو کیشوەرە. دیارە زانستی مرۆڤناسیش تا ڕادەیەکی دیارو بەرچاو، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو هەندێك جاریش بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ یارمەتی دەرێکی گەورە بووە لەجێبەجێ کردنی نەخشەو پلانە ئیمپریالیستەکاندا لەقۆناغی داگیرکاریدا، چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگە داگیرکراوەکان نووسراوە. هەر بۆنموونە: زۆرترینی ئەو مەسەلانەی لەسەر هۆزەکانی (پوختوون) نووسراوە، لەکاتی باڵادەستی ئیمپریالیزمی بەریتانیادا بوو. ئەمەش لەسەر دەستی فەرمانبەرێکی

کۆلۆنیالەکان (مستعمرات) کەناوی (فنستون) بوو، پاشان فەرمانبەرێکی وەك (کازو). هەروەها (ڕۆبەرت مۆنتانی)ی فەرمانبەری بەشی کارگێڕی لەکۆلۆنیالەکانی فەرەنسادا، زۆرترین کتێبەکانی لەسەر هۆزەکانی (بەربەری)ی- مەغریب- نووسیوە. بەڵام وەك دان نانێك بەهەق وڕاستیدا، نابێت ڕۆڵی هەندێك لەو فەرمانبەرانەشمان لەبیر بچێت کە بەویژدان ودادگەرییەوە چەند لایەنێکی ژیانی دانیشتوانی کۆلۆنیالەکانی ژێر چنگی حکومەتە ئیمپریالیستەکانیان تۆمار کردووە. تەنانەت هاوسۆزییەکی زیاتریان لەگەڵ شۆڕشگێڕان ونیشتمان پەروەران هەبووە، بۆنموونە: فەرمانبەرێکی سیاسی وەك (سێر ئیڤلین هاویل)، کە هاوسۆزێکی دیاری هۆزەکان بووەو، دەستووری ڕێسا جوانەکانی ئەو هۆزە موسڵمانانەی، لەدەستوور و ڕێساکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەباشتر داناوە. سیمایەکی تر، کەسەنگی خۆی هەبوو بێت لە لێکۆڵینەوەکانی مرۆڤناسیدا، ئەوەیە بایەخ بەجۆرێك لەژیاننامەی هەندێك کەس دراوە، کە کەسێتییان شێوێنراوە، یان خۆیان سەر بەڕێچکەیەکی داتاشراوی دەستکرد بوون. لەمەشدا چەند فاکتەرێکی، وەك ناوداریی و خانەوادەو ناو و شۆرەت و پلەی کۆمەڵایەتی، کارایی خۆیان هەبووە. تەنانەت هەندێك لەزانا نیشتەجێ بووەکانیان، خۆیان بەعەرەب، یان کورد، یان تورك داناوە، واتە: ویستوویانە مەیلێکی ئیمانداریی بۆ بخولقێنن. کەسێکی وەك (دۆتێ) ڕقێکی زۆری لەئیسلام بووەو، بەڕای خۆی هەرچی لەئیسلامدایە شێواو ناتەواوە.

بەڵام کەسێکی وەك (بلەنت)، بەجۆرێك بەرگی ئیسلامی پۆشیوە، کە گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی خۆی وەك نیمچە موسڵمانێك پیشان بدات.

هەندێك لە فەرمانبەرەکانی کۆلۆنیالەکان، کە خۆیان بەزانا پیشان دەدا، چەند هۆیەکی دەروونی پاڵی پێوە دەنان تا وەك- عەرەب، یان وەك مرۆڤێکی

موسڵمان خۆیان پیشان بدەن، چونکە لەمنداڵیەوە لەوێ ژیابوون. لەچەند ناوەندێکدا کەسێکی وەك (ت.أ.لۆڕەنس) کە کوڕێکی ناشەرعی (زۆڵ)ی پیاوێکی ناوداری دەست ڕۆیشتبوو، وای دەگەیاند گوایە بەخەیاڵ و ئەندێشە و هەستی (عەرەبچێتی)ی خۆی، پلەو پایەیەك لە جیهاندا بۆخۆی بەدەست بهێنێت. ئەمەش لەڕێی ئەفسانەیەکی‌یەوە لەوڵاتە عەرەبیە دوورەکاندا، کە حاکم وئەمیرەکان فەرمانداری بوون و، هەر بەئیشارەتی ئەویش دەجولانەوە، نەریتێکی تری پسپۆڕانی مرۆڤناسی ئەوە بوو، جل وبەرگی میللی ئەو گەلانەیان لەبەردەکرد کە لەگەڵیاندا دەژیان. نەخاسمە کەفێری زمانەکانیشیان بوو بوون و، بەڕەوانی پێی دەدوان، ئەم هۆکارانەش بوارێکی تەواوی بۆ والا کردبوون. کەسێکی وەك (میجەرسۆن)، لەچەند ناوچەیەکی کوردستانی عێراقدا، وەك هاووڵاتی‌یەکی کورد خۆی دەردەخست، تا دواجار شاعیری بەناوبانگ (تاهیر بەگی جاف) لەماڵی خۆیاندا پەردە لەسەر ڕووی لادەدات و، (غلام حسین)ی ساختە (کەناوی هەڵبەستراوی- سۆن- بوو)، بۆ هەمیشە کەشف دەکات. هەروەها (شارل بیرتۆن) کە لەدواییدا سووکایەتی بەسەرۆك هۆزەکان کردبوو، گوایە ئەوان ئالودەی هەر ئارەزوویەکن لەو ئارەزووە منداڵیانەی لێیان حەرام کراون. بەڕای (بیرتۆن) سەرەك هۆزەکان پیاوانێك نەبوون کە هەر یاری بەچارەنووسی منداڵان بکەن، دوای ئەوەی لەوەوبەر چەند نەوجەوانێك بوون یاریان بەچارەنووسي پیاوان دەکرد. ئەوان جگە لەوەی پادشا و پێشەوایانیان دادەنا و لەسەرکاریشیان لادەبرد، لەهەمان کاتدا نازناوی سەیرو سەمەرەی ئەوتۆیان بەخۆیانەوە دەنا، کە بێ‌شەرمانە خۆیان بەکوڕی وڵاتێك، یان شارێك، یان نەتەوەیەکی ڕۆژهەڵات لەقەڵەم دەدا. بۆنموونەش سەرنج لەچەندین ناو و نازناوی لەم جۆرانە بدە [٨٦]:- (گۆردانی- خرطوم/Gordan Khurtoum of)، (ڕۆبەرتس-ی قەندەهار Roberts Of Qandahar)، (لۆڕەنس-ی

عەرەب Lawrence Of Arabia)، (ئیدوارد- ی بانوو Edwards Of Bannu)، ئەوان، نەك هەر چەند ڕۆژهەڵاتناسێکی لەڕێ لادەر بوون، کە بەچاوی عەبەسیەت بۆ داب ونەریتە ڕەسەنەکانی گەلانی ڕۆژهەڵات بڕوانن وفەرهەنگ وکلتوور و بەهای بەرزی کۆمەڵایەتیشیان پێشێل کەن، بەڵکو زۆر لەوە دڕندەتریش بوون، تەنانەت زۆر ڕەگەز پەرست بوون سەرەڕای ئەوەی بەڕواڵەت خۆیان لەنێو کۆمەڵگەی خێڵەکیدا نواندبووە، چونکە تەواو خۆیان بۆ ئەو ئەرکە ئیمپریالیستییە تەرخان کردبوو. هەرگیز کلتووری سیاسیو ئیمپریالیستانەی ئەورووپا بێ تاوان نییە، کاتێك نەخشەی بەیدەست کردنی ژیانی عەشایەریان داڕشتووەو، پاشان ئیدارەی حاڵەت ودۆخ وکاروباری حوکمڕانیان کۆنترۆڵ کردووە، ناوچە کۆلۆنیالیو داگیرکراوەکانی ژێر دەستی هەردوو ئیمپریالیزمی فەرەنسی وبەریتانی باشترین شایەتی زمان حاڵی ئەم ڕاستیەن. بەڵام کاتێ ڕۆڵەکانی ئەم هۆزو عەشیرەتانە لەدۆڵ وچیاو گوندو شارەکانیاندا هۆشیار بوونەتەوەو توانیویانە هێزێکی میللی و جەماوەری پێك بێنن، تا بەتوندی بەرەنگاری داگیرکەران ببنەوەو، دەیان داستانی قارەمانیەتیان تۆمار کردووە، کەچی ڕۆژهەڵاتناسان وزانایانی بواری کۆمەڵناسیەکەیان ئەو هۆزو تیرانەیان بەدزو جەردەو پیاو کوژ لەقەڵەم داوە. (بۆ وێنە: پرۆفیسۆرێکی ئەنسرۆپۆلۆژی کەناوی "Von bick stedt"ە، کتێبێکی بەناوی "تورك وکوردو ئێرانی لەکۆنەوە تائێستا) لە- ١٩٦١دا- دەرکردووە.

ئەم کابرایە لەهەر لایەکەوەو بەهەر بۆنەیەکەوە ناوی کوردی هێنابێ، نووسیویەتی (کوردە جەردەکان) [٨٧]. کابرایەکی تر، ڤۆگەڵ (Vogel) (٨٨). ناوێك کە لەکن خۆی دکتۆری فیزیکە، لەگەڵ چەند کەسێکی تر چووە بۆ کوردستانی تورکیا. هەرچەندە میوانداری کوردی ئەگێڕێتەوە بەڵام دیسانەوە لەوتارەکەیدا، کە لەبارەی ئەو گەشتەوە نووووسیویەتی کورد بەجەردە ئەداتە

قەڵـەم. پـەیوەندی نـێوان ئیمپریالـیزم و(مرۆڤناسـی)، تـا دوای جـەنگی جیهانی دوەمیش بـەردەوام بـووە کاتێك زۆربەی وڵاتە موسڵمان نشینەکانیش، لەچنگ داگیرکـەر ڕزگـار بـوون ولەچـەند وڵاتـێکی بچـووك و بـەش بـەش کـراودا دەرکەوت، بـەڵام زانایانی مرۆڤناسی بەریتانی لەپاش ئەو جەنگەش هەر لەناوچە کۆلۆنیالەکانی سەر بە بەریتانیادا فەرمانبەر بوون. وەك (ئیڤانس پریچارد) و (لـیچ) و(نـادیل) و لەهەمووشیان دیارتر"پریچارد" بوو، کە بەرپرسی کاروباری خێڵەکی بوو لەشاری (بورقە) لەلیبیا. ناوبراو چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەر کلتوور و داب ونەریتی هۆزەکانی بیابان هەیە. ئەو لێکۆڵینەوانەش بوونەنمونەی کـردەیی (عمـــلي)، لەبواری پەیڕەوکردنی (تیۆری کەرتەکان لەسەر کۆمەڵگە خـێڵەکی‌یەکان). بـەم ڕەنگـەش (تـیۆری کەرتـەکان) بـۆ کایـەی پراکتـیزەي سرووشتیی سەر ئەو خێڵە ڕەشماڵ نشینانەی، کە (ڕۆبەرت سۆن سمیس) لەوەو پـێش سـەرنجی بـەلایاندا ڕاکێشـا بـوو، گەڕێـنرایەوە. بـەم پێـیەش یەکـەمین پەیـڕەوکاریی لـەبواری مرۆڤناسییدا هێـنایە کایـەوە، ئـەویش لەتوێژینـەوەیەکدا دەربـارەی هۆزەکـانی (نویـر) کـە (ئیڤانس پریچارد) نووسیبووی و، وای بەدیار خستبوو گوایـە کۆمەڵگـەی خـێڵەکی بونـیادی دەرەبـەگ گشـتیان لەئەفـرادی تیرەیـەك پـێك دێـن و، بۆ چـەند ڕەگـەزێك دەگەڕێـنەوە، کە پەیوەندی خزمایەتی پێکیانەوە دەبەستێتەوە. بـەڕای ناوبـراو ئـەو چەند کەرتە خێڵەکیانە، وەك چەند هـیلانەیەکی باڵدارانن. پێش ئەو توێژنەوەیەش ئەو هۆزانەی (نویر) یان وا دەبینی کـە لەژیانێکی سـەرەتایی پڕ ئاشوبدا دەژین و، هیچ جیاوازی‌یەکی کۆمەڵایەتی لەنـێوان ڕۆڵـەکانی ئـەو هۆزانـەدا نی‌یـە. لـەخوارووی ئاسیاش ڕەگ وریشـاڵی ئیمپریالیستانەی زانستی مرۆڤناسیی، بۆ نیوەی دووەمـی سـەدەی هەژدەهـەم، یـاخود بـۆ کۆتایـیەکانی ئـەو سـەدەیە دەگەڕێـتەوە. بـۆ نموونـە: (هێـنری مـین)ی ئـەندامی یاسـایی لەئەنجوومـەنی نوێـنەرانی پادشـا لـە(هیـند) تـەواوی سەربەستی

هەبوو لەپڕوپاگەندە بۆ خۆکردندا دەربارەی ئەوەی گوایە هەر خۆی بنەماکانی (مرۆڤناسی) داناوە کە تایبەت بووە بەدیراسەکردنی لادێکانەوە لەهیندستان ئەویش لەهەردوو کتێبیدا بەناوی (یاسای کۆن/١٨٦١- Ancient Law : 1861) و (کۆمەڵگە دێهاتی یەکان لەرۆژهەلات و رۆژئاوادا / Village Communities In the East & West) ڕۆژهەڵاتناسێکی دیکەی وەك (لیار) کە دواتر بووە بەحاکمی (کەرتەکانی باکووری ڕۆژئاوا)، کتێبێکی لەساڵی (١٨٨٢ز) دا بلاوکردۆتەوە بەناوی (چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئاسیایی: باوەڕداری وکۆمەڵایەتی /Religious & Social:Asiatic studies ) بەرپرسانی ئیداری ئیمپراتۆریەتیش، بەحوکمی کاریانەوە لەهەمان مەیداندا بەشداری زانایانی (مرۆڤناسیی)یان دەکردو گەورەترین توانایشیان لەو ڕووەوە تەنها شارەزایی مەیدانی بوو.

# لەپشت مرۆڤناسیییەوە

هەرگیز ناشێت (سیستەمی دەرەبەگایەتی)و (ژیانی خێڵەکی)پێکەوە هەڵکەن، یان پێکەوە بلکێنرێن، چونکە (دەرەبەگایەتی) وەك رژێمێکی حوکمی پاشایەتی لە لایەکەو، قەوارەی سەربەخۆیی خێڵەکایەتیش لەلایەکی ترەو، پاشان هەر یەکەشیان لە جەمسەرێکی دژو هاوتەریبی بوارە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیانن) (دەرەبەگایەتی) وەك ئاشکرایە جۆرێکی نا ئاسایی کۆمەڵگەیە، کە روخساری تایبەتی خۆی هەیە.. زۆر جاریش ڕۆژهەڵاتناسان خێڵە عەرەبەکان، یان هەر خێڵێکی تری موسڵمانی غەیر عەرەبیان بە دەرەبەگایەتی وەسف کردووە..مرۆڤناسەکانیشیان هەرگیز لە ناشیرین کردنی مێژووی ئیسلام وبریندار کردنی هەستی موسڵماناندا سستیان نەنواندوە. یەکێك لەو زاراوە سەیر و داتاشراوەنەشیان، کە بۆ وەسفی ئیسلامیان داناوە، زاراوەی (محمدی)یە کە تەنانەت هەر وەك لە کتێبەکانی (جب) و (گرونباوم)دا هاتووە. موسڵمانانیشیان بەم زاراوەیە ناو بردووە [٨٩] لە فەرهەنگی (ئۆکسفۆرد)یشیاندا سەرەڕای نارەزایی موسڵمانانیش زاراوەی (محمدي) بەکارهاتووە. هەروەها(لاڤن) لە کتێبێکیدا کە ساڵی (١٩٨١) بڵاوکراوەتەوە هێرشێکی توندوتیژی کردۆتە سەر ئیسلام، کە دیارترین نموونەی سوکایەتی وبێ حورمەتی بە ئیسلام کردنە. ناوبراو وەك هەر ڕۆژهەڵاتناسێکی بێ ویژدانی تریان، لە بەندێکی کتێبەکەیدا بەناو نیشانی (هەڵسەنگاندن) دەربارەی ژیاننامە (سیرەتی)پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)، لەتێڕوانینی ڕۆژئاوادا، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ کەسێتییەکی دڕندەی وەك (ئەدۆڵف هیتلەر)ی دیکتاتۆری- نازی- ئەڵمانی- دا بەراورد دەکات، پاشان دەڵێت: چۆن هیتلەرو تاقمەکەی بەدەمارگیری

نەتەوەپەرستی دەجولانەوە، پێغەمبەرو شوێنکەوتوانیشی بەهەمان نەریتی دەمارگیری جوڵاونەتەوە (٩٠).

(لاڤن) و(لویس) وهاوڕێکانی تریان ئەم جۆرە کتێبانەیان چەند ساڵێك لەدوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانی بڵاوکردۆتەوە. بەتایبەتیش ئەو کتێبەی- لاڤن- کە باسی کەسێتی (هیتلەر)ی تێدا کردووەو، شازدە ساڵ دوای جەنگی دووەمی جیهانی بڵاوی کردۆتەوە. واتە لەو ساتەوەختانەدا، کە هێشتا خووی (هیستیریا) لە ئەوروپا بەرانبەر بە ئەڵمانیەکان زۆر بەهێز بوون نیازی دانەری کتێبەکە لەو کاتانەدا زۆر ڕۆشن وئاشکرا بووە.

زانایەکی کۆمەڵناسیشیان، کە (پاتیە)یە بیروڕایەکی گەندەڵی وەهای دەرهاویشتبوو، کە چۆن دەبێت لەکۆمەڵگەی موسڵماناندا پێشەوایانی وەك (هیتلەر) هەڵکەوتبن ؟.

لەمەشدا مەبەست لەشەخصی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و، هەر سەرکردەیەکی خواناسی ئیسلامیشە. ڕۆژهەڵاتناسان هەر بەوەندە ڕانەوەستاون، بەڵکو لەکتێبێکی چەند ساڵێك لەمەوبەریاندا بەناوی (هاجەریزم- وهاتنە ئارای جیهانی ئیسلامی- Hagarism: The Making Of The Islamic World) کە هەردوو نووسەر (کرۆن) و(کووك) لەساڵی ١٩٨٠ز دا نووسیویانە، خەنجەری ژەهراویان لە جگەری ئیسلام دەدەن، لەڕێی هێرشی کوێرانە و تەقلیدیانەوە تیرو توانج، لەحەقیقەتی پێغەمبەرێتیش دەدەن. دیارە لەم کتێبەدا بەشێوەیەکی گەلێك سەخت ترو بێ شەرمانە تر، ئەم ڕێچکەیان گرتۆتە بەر. ناونیشانی کتێبەکەش (هاجەریزم) لەناوی (هاجەر)ی هاوسەری (ئیبراهیم)ی پێغەمبەری خوداو، دایکی- ئیسماعیل- ەوەیە (درودی خودایان لەسەر بێت). دیارە ئەوپەڕی جێی سووکایەتی و بەدخوویشە، کە لەقاموسە

ئینگلیزیەکاندا، وشەی (هاجەریزم) مانای خراپترین سیفەتی شەخصی دەگەیەنێت. هەردوو نووسەرەکەش، لەو کتێبەیاندا دوای درۆو دەلەسەیەکی زۆر، وای لەقەڵەم دەدەن، گوایە چەندین بەڵگەنامەی ئەصڵی و هاوچەرخیان لەبارەی سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلام چنگ کەوتووەو ئەوە دەردەخەن لەئیسلامدا ئەرك وپایەی پێغەمبەرایەتی بە (عومەری کوڕی خەتتاب) سپێرراوە و، بەپێی ئەم تیۆرە پووچەڵەی ئەوان (محمد) بۆ ئەوە نێررابوو کە مژدەی پێغەمبەرایەتی (عومەر) بگەیەنێت، بەڵام لەدوایی ئەو ڕۆڵە گرنگەی بۆ خۆی دانا. ئینجا نووسەرانی کتێبەکە گومان وتەم ومژ لەسەر ڕاستی وحەقیقەتی - هیجرەت- دروست دەکەن، کە ڕووداوێکی ساتەوەختی مێژوویی بووە. بەم ڕەنگەش ڕقی خاچپەرستانەیان دەردەبڕن و، لەشێواز و مەنهەجی لێکۆڵینەوەی بابەتیانەو زانستیانە دەردەچن. لەتوێژینەوەیەکی بەراوردکاریشیان دا، لەمەڕ سەمتە فیکریەکانی هەر یەکە لەئیسلام ویەهودیەت و نەسرانیەت، ئەو دەرەنجامە ناماقوڵەیان دەخەنە ڕوو، گوایە واقیعی موسڵمانان وایە، کە تەنها بەخەندەو پێکەنینی ئافرەتانیان بەکێش دەکرێن.

(کرۆك) و(کوك) پێشبینی ئەوەشیان کردووە، کە کتێبەکەیان هەست ونەستی موسڵمانان دەڕووشێنێت. لەم بارەیەوە گوتوویانە:- (ئەم کتێبە کافران لەپێناوی کافراندا نووسیویانە) [٩١]. بەم وتەیەش دەیسەلمێنن، ئەوان هیچ خواست و ئارەزوویەکیان بۆ گفتوگۆی زانستیانە نییە.

خۆ هەرچەندە بۆ موسڵمانان زۆر ئاساییە، کە کتێبێکی بێ ماناو بێ ناوەڕۆکی لەم چەشنە پشت گوێ بخەن، بەڵام پێویستە زانا موسڵمانەکانی دانیشتووی ئەوروپا، وەڵامی زانستیانەی تەواوی لەسەر بڵاوبکەنەوە، تاکو هەروا بەئاسانی چەندین چین وتوێژی خەڵکی ڕۆژئاوا بەدرۆو دەلەسە چەواشە نەکرێن، چونکە کتێبێك کە دوو پرۆفیسۆری دانیشگای (لەندەن) نووسیبێتیان

وچاپخانەیەکی دانیشگای (کامبریدج)یش بۆیانی بڵاوکردبێتەوە، کاریگەریەکی نێگەتیڤانەی خۆی هەر دەبێت و، نەبوونی وەڵامی گونجاویش لەو ناوەندەدا، وا پێ دەچێت جۆرە دەستەو سانیەکی موسڵمانان پیشان بدات.

چەندین ڕۆژهەڵاتناس وزانای بەناو کۆمەڵناسی تریشیان لەوپەڕی حەقیقەت ورقی ڕەشی خۆیانەوە، سەردەمی پڕشنگداری پێغەمبەر (ﷺ)، بەسەردەمێکی پڕ لە توندوتیژی و وەحشیگەری ناو دەبەن و، سەردەمی سیخوڕیی خۆشیان بەسەردەمی ئاشتی وهێمنی ناودەبەن. تەنانەت یەکێکی وەك (مونتیگمیری وات) هۆی کوژرانی دوژمنی ئیسلام (کەعبی کوڕی ئەشرەف) بۆ فەرمانی تایبەتیی پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە گوایە تۆڵەی خۆی لێ کردۆتەوەو، نابێت ئەم جۆرە فەرمانە لەپێشەوایەکی ئایینییەوە دەربکرێت. (وات) سەردەمی خۆی لەگەڵ سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەو ڕەنگە بەراورد دەکات، کە ئەو هەڵس وکەوتە لەو زەمانەدا ئاسایی بووە. بەواتەیەکی دی:- (وات) دەیەوێت ئەو پرسیارە بورووژێنێت، کەوا ئیدی چی لەکەسانێك ڕادەبینین، کە بەڕەفتارە گشتییەکانەوە پابەند نین ؟! پاشان دەڵێت: (ئێمە گەلێکی مەبدەئی وچاکە خوازین بەڵام ئەوان " واتە خەڵکی ڕۆژهەڵات" خراپکارو بێ مەبدەئن). (ئیدوارد سعید)یش ئەم وتەیەی پێچەوانە کردۆتەوەو، سەلماندوویەتی، کە سیفەتی خراپەکاری هەر لەواندایە (واتە لە ڕۆژئاواییەکاندا) [٩٢].

ژمارەیەکی زۆریش لەزانایانی مرۆڤناسیی ئەم ڕێنماییەیان لە ڕۆژهەڵاتناسانەوە پەسەند کردووەو، جیاوازییەکی گوێڕەیییان لەنێوان کۆمەڵگەی (هێمن) و(نائارام)دا کردووە بەهۆیەك بۆ جیاکردنەوەی هۆزە خێڵەکییە سەرەتاییەکان لەگەلانی دانیشتووی شارەکان.. لەم ڕووەوە (سالینز) دەڵێت: (جیاوازی کردن لەنێوان هەردوو- حاڵەتی- خێڵەکی- و-

شارستانی- لەفراوانترین مانایدا، جیاوازی کردنی نێوان جەنگ وئاشتی‌یە، چونکە پیاوانی خێڵەکی بەهۆی نەبوونی ئامێرو کەرەستە پێویستەکانەوە لەحاڵەتی جەنگی هەمیشەیی‌دا بوون. بێ گومان جەنگیش ڕێگە لەگەشەکردنی کلتووریان دەگرێت) (٩٣).

جا ئەگەر جەنگ وکوشتار هەمیشە لەنێوان پیاوانی خێڵەکیدا بووبێت، ئەی داخۆ- سالینز- و هاوڕێکانی تریشی چ تەفسیرێکیان بۆ سالآنی جەنگی جیهانی هەیە، بەتایبەتیش هەردوو جەنگە جیهانی‌یەکەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، کە لە توندوتیژی و وەحشی گەری و کاولکاریدا، هەرگیز وێنەو هاوشێوەیان نەبووە، تەنانەت توندو تیژی ودڕندەیی ڕۆژئاوایی‌یەکان گەیشتە ئەو ڕادەیەی چەکی ئەتۆمی تێدا بەکار بێنن. ئەمڕۆش مەترسی جەنگی سێ‌یەمی جیهانی لەئارادایە، کە تەنیا چەکە ئەتۆمی‌یەکانی تێدا بەکار بهێنن وهەموو ئەو کۆمەڵگەو شارستانی‌یەتانەی بنیات نراون، بەچەند چرکەیەك خاپوور دەکەن. دیارە ئەم جۆرە جەنگە بە پیاوانی خێڵەکی ناکرێت. بەڵکو بەو حکومەتە (مرۆڤدۆست!) و(پێشکەوتنخواز)انەی ڕۆژئاوا دەگێڕرێت. جا تۆ بڵێی ڕۆژهەڵاتناسان و زانایانی ئەنسرۆپۆلۆژیی، لەوتەو نوسینەکانیاندا هێندە پەرۆشی کۆمەڵگەی "ئارام" بووبن ؟ گەر وابێت چ پاساوێك بۆ ئەو سەدان ملیۆن کوژراوانە دێننەوە، کە لەسەردەمی (ستالین) و (هیتلەر) و (ماو) و (چەرچڵ) و (ئایزنهاوەر) و (پۆڵ پۆت) و (ئەتاتورك) و هاوپیشەکانیان کوژراون ؟ ڕۆژئاوایی‌یەکی وەك (هیتلەر)، تا ئەمڕۆش بەقەڵاچۆکردنی زیاتر لەشەش ملیۆن کەس بەنەریتێکی دڕندانەی وەها، کە لەوەوبەر وێنەی نەبووە، تاوانبار کراوە. ئەمەش لەو سەردەمەدا کە ڕۆژهەڵاتناسان بەسەردەمی ئارام وخۆشگوزەرانییان ناوبردووە، بەڵام سەردەمی‌سەرهەڵدانی ئیسلام وبنیاتنانی دەوڵەتی پڕ لەدادو یەکسانی‌ی ئیسلامی و ڕووخاندنی هەردوو ئیمپراتۆریەتە

شەڕخوازەکەی (فارس) و(ڕۆم) و ڕزگارکردنی زۆربەی گەلانی ئەو سەردەمەی جیهان، لە شەوەزەنگی جاهیلیو ستەم بەسەردەمی پڕ ئاشووب وشەڕی خۆبەخۆی خێڵەکی ناودەبەن.

(هیتلەر) بەسوپایەکەوە ڕووی لەهەر شارێکی ئەوروپا دەکرد، خاپوری دەکرد. بەڵام پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێك فەتحی شاری- مەککەی- کرد، لەهەموو ئەو کەسانەش خۆش بوو، کە بەوپەڕی دلڕەقی و بێڕەحمییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو سوکایەتی‌یەی، کە لەسەر دەستی مەککەیی‌یەکان پێی کرابوو، لەگەڵ چوونە نێوشارەوە نەك هەر ڕەحم بەگشت ناحەزێکی دەکات، بەڵکو فەرمان بەپاراستنی سەگێکیش دەکات، کە لەو کاتەدا تره‌کی بوو و، چەند تووتکێکی ببوو، چونکە نابێت لەو گۆڕانکاری‌یە تازەیەو لەو کەشە ئازادەدا لانەی لێ بشێوێت. فەتحی- مەککە- خاڵی وەرچەرخان بوو لەمێژووی ئیسلامدا، نەك موسڵمان کردنی خەڵکی بەزەبری شمشێر. بەدرێژایی ئەو چەند ساڵەی بانگەوازو گەیاندنی ئیسلام، هەزار کەس نەکوژرا، ئەم ژمارەیەش باجێکی هێجگار کەمە لەبەرانبەر گەورەترین ودژوارترین شۆڕشی جیهاندا. نکوولی لەو حەقیقەتەش ناکەین، کە ناوبەناو لەهەندێك ناوچەدا بەنەریتی دەمارگیریی تایفەچێتیو، بەهۆی چەند پیلانێکی دووڕووە شەڕخوازەکانەوە، شەڕی خێڵەکی بەرپا کراوە، بەڵام تا ئەمڕۆش لەچەندین شوێنی جیهاندا دیاردەی دوژمنایەتی و پێکدادان لەنێوان هۆزە جۆر بەجۆرەکاندا هەیە، تەنانەت لە(ئێرلەندە)دا ناکۆکیی تیرەگەری لەنێوان (پرۆتستانت) و(کاسۆلیك)ەکاندا، تا ئەمڕۆش بەردەوامە. یەکەمین هۆی (ناکۆکی خێڵەکی)یش بەکەمی ئاستی هوشیاریو وجودی حوکمی نەفامی ونەبوونی باوەڕێکی پتەوی ئینسانی، لەدڵی ڕۆڵەکانی عەشایەردا بەندە. پاشان هەر خودی ئیمپریالیزم ودەوڵەتە داگیرکەرەکانیان پلانێکی زۆریان گێڕاوە

لەناشتنی تۆوی دووبەرەکی ودوژمنایەتی‌داو، لەبەکرێ گرتنی چەند کەسێکی نەفس نزم و گێرە شێوێن دا بۆ ئاژاوەنانەوە. تاکە ڕێسای هەرە دیاری ئیمپریالیزم لەم ڕووەوە سیاسەتی (پەرت کەو زاڵ بە) بووە. پرۆسەی پەرت پەرت کردن وخولقاندنی پەرتەوازەییش هەر لەڕێی خولقاندنی ناکۆکی وشەڕو شۆڕەوە بووە.

مێژوونووسی مەغریبی(عبدالله العروي) دەڵێت: (کاتێك خۆرئاواییەکان هۆزو تیرە شاخاوی‌یەکانیان وا وەسف دەکرد، گوایە لەنێو خۆیاندا یەکتر دەکوژن، ئیدی بەم وەسفەی خۆیان گوزارشتیان لەو نیازە ئیمپریالیە دەکرد بۆ بەدی هێنانی مەرامەکانیان، دەنا مەبەستیان لەناساندن وزانینی هۆکاری ناکۆکی تیرەگەریی نەبووە).

کەوابوو سەرەڕای ڕۆشنیی ئەو نیازە ئیمپریالی‌یەشیان، بەڵام لای ئەوان سیمای ئۆپۆرتۆنیزم(فوضوية) لەکۆمەڵگەی خێڵەکی‌دا کەلەپوورێك بووە، کە بەردەوام جێگەی تایبەتی‌ی لە ئەنسرپۆلۆژیادا بۆ دانراوە. لەم بارەیەوە (میکەر) دەڵێت: (بەشێکی گەورەی کەلەپووری خێڵەکی لەباکووری دورگەی عەرەبی‌دا، لەسەر ئەو بیرۆکەیە دەسوڕێتەوە کە: (توندوتیژی) تەوەرەی ژیانی سیاسی‌یە. خەڵکیش هەر لەگۆشەنیگای توندوتیژی‌یەوە بۆ خۆیان وپێویستی وپێوەندی‌یەکانیشیان ڕوانیویانە). هەروەها(فریدریك بارت) دوای لێکۆڵینەوەی لەهۆزەکانی(پوختن سوات) ئەو دەرەنجامەی پیشان داوە، گوایە ئەوان زۆربەی کاتیان لەشەڕو پەلامارو هەڵکوتانە سەر یەکتردا بەسەر دەبەن و، لەم ڕووەوە هەرگیز ئارەزووی شەڕخوازییان تێر نابێت.

❀❀❀ ❀❀❀

# چەند لایەنێکی تری ئەنسرۆپۆلۆژیا

دیارە تا ئەمڕۆش کۆتاییی‌یەك بۆ کاریگەریی ورۆڵی ڕۆژهەڵاتناسان دانەنراوە، چونکە کەسانی وەك (ئارپیری) و(جب) و(لویس) و(ڤۆن گرۆنبۆم) و(وات) بونیادێکی مەنهەجییان بۆ زۆربەی لێکۆڵینەوە ئەنسرپۆلۆژی‌یەکان دانەناوە، لێکۆڵینەوەکانی "ریچارد تاپەر"یش کاراییی‌یەکی دیاری ڕۆژهەڵاتناسانی تری وەك (لامتن)ی پێوە دیارە. تەنانەت هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان وەك (میکەر) و(ئیکلمان) کە لەم دواییی‌یەدا هەوڵیان دەدا لەسەر بناغەیەکی ویژدان پەروەریی ودادگەرێتی توێژینەوەکانیان داڕێژنەوە، نەیانتوانیبوو بەتەواوەتی خۆیان لە کەلەپوورو میراتی ڕەگەزپەرستانەی ڕۆژهەڵاتناسیی قوتارکەن. تەنانەت- هۆدجسۆن- یش کە ساڵی (١٩٧٤ز) بەنووسەری لێکۆڵینەوەی پوختی هاوچەرخ ناسراوە، هێشتا بەتەواوەتی لێکۆڵینەوەکانی لەکاریگەرێتی ڕۆژهەڵاتناسیی نەپاڵاوتووە. (ئیکلمان) لەو لێکۆڵینەوە کورتەیدا، کە ساڵی (١٩٨١) دەربارەی مرۆڤناسیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نووسیویەتی، پەنای بردووەتە بەر زۆرترین سەرچاوەی (زانایانی پێش خۆمان). دیارە لەم وشەیەدا مەبەستی تایبەتی هەیە و، ڕۆژهەڵاتناسانیان بە(زانایانی پێش خۆیان) داناوە. (میکەر) و(ئیکلمان) نەیانتوانیوە خۆیان لەو ڕق وکینەیەی (دۆتێ) کە دژی ئیسلام دەری بڕیوە، بپارێزن.

لایەنێکی تری لێکۆڵینەوەکانی (ئەنسرپۆلۆژیا) دەربارەی ئافرەتە، وەك کتێبەکەی (هێنی هارۆڵدهانسن) بەناوی (ئافرەتی کورد). باشترییش بڵێین لێکۆڵینەوەکانی ئافرەتانی ڕۆژهەڵاتناسیی خۆرئاوا دەربارەی ئافرەتی موسڵمان، کە لەسەر هەمان ڕێساو بنەما تەقلیدی‌یەکەی ڕۆژهەڵاتناسیی

وپیاوەو ڕۆژهەڵاتناسەکانیان نووسراون. واتە وەك چۆن پیاوانی ڕۆژهەڵاتناس، لەسەر ئەو کۆمەڵگەو مرۆڤانەی ڕۆژهەڵات نووسیویانە. ژنانی ڕۆژهەڵاتناسیش لەسەر هەمان دیاردە نووسیویانە. یەکێك لەو لێکۆڵینەوە تازانەی، کە لەسەر ئافرەتە موسڵمانەکانی شاری (دلهی) نووسراوە، بەناوی (چەند بۆقێك لەبیرێك دا) و(جیفری) لەساڵی ۱۹۸۰دا نووسیویەتیو هەر بەناونیشانەکەیدا دیارە نە ژنانی موسڵمانان ونە ژنانی غەیرە موسڵمانیش بەو وەسفە قایل نابن. نەخاسمە بەو جۆرە لێکۆڵینەوانەش، کە ڕەگەزپەرستی ولوتبەرزی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەردەخەن جگە لە (جیفری)یش کەسانی وەك (بیك) و(فێرنیا) و(کیددی)، لێکۆڵینەوەی لەم جۆرەیان لەسەر ئافرەتانی ڕۆژهەڵات بڵاوکردۆتەوە.

هەروەها چەندین نووسراوی تر کە لەم دواییەدا دەرکەوتوون ڕاستەوخۆ هێرشیان لەسەر ئیسلام تێدایە، وەك کتێبەکەی (بریان تورنەر) بەناوی (وەبر- و- ئیسلام) کە ڕاستەوخۆ تانەو تەشەر لە کەسێتی پێغەمبەر (ﷺ) دەگرێت. یان (فریدریك بارث) بەپاساوی لێکدانەوەی بایەخ دەری مرۆڤناسی بۆ هەڵس وکەوتی مرۆییی هۆزەکانی (پوختن سوات) لە کلاوڕۆژنەی ڕووداوێکی سەر هێڵی شەمەندەفەرەوە، ڕەخنە لەنەبوونی فەرهەنگی کۆمەڵگەی نوێ دەگرێت کاتێك شۆفێری پاسێك کە یەکێك لەسەرنشینەکانی (خودی- بارث) بووە، ڕێگە بە ئۆتۆمبیلێك نادات بەسەر پردی (نوشیرا)دا بپەڕێتەوە، واتە ئەو پردە کۆنەی بۆ هێڵی هاتووچۆی شەمەندەفەریش دروست کرابوو، پردێکی (یەك سایدی) بووە، ئینجا لەکاتی هەراو پرتەوبۆڵەی هەردوو شۆفێری پاس وئۆتۆمبیلەکەدا، شەمەندەفەرەکە بەوێدا تێدەپەڕێت و، ماوەی چەند خولەکێك دوایان دەخات. جا ئەگەر بێینە سەرباسی هەڵس وکەوتی هەندێك لەشۆفێران، ئەوا لە ڕۆژئاواشدا، ڕۆژانە سەدان وهەزاران شۆفێر، بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵس وکەوتی مرۆڤی ڕۆژئاوایی دەکرێنە نموونەو بەڵگە.

ئەو نموونەیەی- بارث- یش دوای گەڕانێکی زۆری بەو ناوچانەدا، بەهیچ جۆرە نموونەیەکی زانستی بۆ لێکۆڵینەوەی مەیدانی دانانرێت، چونکە بەدروست کردنی- سایدێکی دووەم- هیچ سەنگێك بۆ ئەو دیدو بۆچوونانە نامێنێت.

(پیرسۆن)یش لەگەڕانی بەنێو هۆزەکانی- بەللوچ-دا، ئەو بیروڕا نامۆیە دەردەخات، گوایە ژیان لەگەڵیاندا ناگونجێت، لەبەر ئەوەی سیفەتی دووڕوویی‌و کینە بازیی‌یان تێدا بڵاوە. لەلای (هۆبز)یش مرۆڤ هەمیشە لەحاڵەتێکی جەنگ دایەو، هەر یەکە ئەوی دی دەکوژێت. بەڕای ناوبراو، ژیانی مرۆڤی موسڵمان، ژیانی گۆشەگیریی‌و بێ تام وپێزو کورت خایەنە. هەمان بۆچوونی ناڕاست، لەنووسراوو گەشتنامەکانی هاوسەرەکەی(بارث)دا ڕەنگی داوەتەوە. ژنەکەی (بارث) دوای سەوداو هەڵس وکەوتی لەگەڵ ئافرەتە موسڵمانەکان دا، بەتایبەتیش لەگەڵ ژنە هەژارەکانی- قاهیرە- دا، بەو دەرەنجامە تایبەتی‌یەی خۆی گەیشتووە، گوایە ئافرەتی موسڵمان بەچاوی گومانەوە بۆ کەسانی تر دەڕوانن و، متمانەیان بەکەس نی‌یە. یان گوایە زۆربەی کاتەکانیان لەدژایەتی‌و نامۆیی بەسەر دەبەن. (ویکان)یش لەکتێبێکی ساڵی ۱۹۷۷دا، ئەم بۆچوونەی ناوبراوی دیاری کردووە. پاشان ژنەکەی (بارث)ی ڕۆژهەڵاتناس کاتێك لە(قاهیرە) وێنەی کەسێتی‌ی "مێیینە"ی کێشاوە ویستوویەتی بەهەمان وێنەی جەنگاوەرێکی (پوختن)ی دابنێت، کە ژیانی لەسەر شاڵاو و تاڵانی کوشت و بڕە. تا بەم ڕەنگەش مەنهەجێکی گۆشەگیریی‌و تەنیایی(فردیە) لەژیانی‌دا بخولقێت.

ئایا ئەم بیروڕاو بۆچوونە ژەهراویـیانە لێکدانەوەی چەند دیاردەیەکی کۆمەڵایەتین، کە لەسەر بناغەیەکی تێڕامان وئەزموونگەریی- خرابنە ڕوو،

یاخود نکوولی کردنی تیمێکی ڕۆژهەڵاتناسیه کە لەپیاوێك و ژنەکەی پێك هاتووەو، ویستوویانە تیۆرە بێ‌نیۆڕۆکەکەیان بە سەر واقیعی ژیانی موسڵمانانندا ساغ کەنەوە.

هەروەها (ویکان) لەوڵاتێکی سوڵتان نشینی وەك (عومان)دا، ئاماژە بۆ وجودی: جنسی سێیەم. (نیرەمووك) دەکاو، بەم داهێنان و(إکتشاف)ە زانستی‌یەشی، مشت ومڕێك لەبواری- مرۆڤناسی-دا دەخرۆشێنێ، هەر وەك لە گۆڤاری (Man) لەساڵی (١٩٧٨)دا بڵاوی کردۆتەوە. توێژەوەرە موسڵمانەکان لەبارەی دیراسەی ناوبراوو لەمەڕ وجودی (جنسی سێیەم)یش، دەڵێن: هیچ وردە کاریەکی زانستی‌یانەی تێدا بەدی ناکرێت [٩٤].

کەوابوو ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەی، کە ناوی (مرۆڤناسی)یان لێ‌نابوو، تەنها ڕۆژهەڵاتناسیی و هەوڵێکی بێ ئامانجی سووکایەتی کردن بەکەرامەت وڕێزی گەلانی ڕۆژهەڵات بووە. یەکێکی وەك (بارث) لەڕێی پلارگرتن لەهۆزەکانەوەو تاوانبارکردنیان بە کوشتارو شاڵاو بۆ سەر یەکترو، تەنانەت ناوبردنی دیوەخان وناوەندە کۆمەڵایەتی‌یەکان وژوورەکانی میوانداریش بەچەند (بنکەیەکی جەنگی‌و چەند بارەگایەکی سەرکردایەتی) هەمان ڕوانینی تەقلیدی ڕۆژهەڵاتناسیی دەردەبڕێت، کە چۆن بۆ کۆمەڵگەی گوندنشینی وژیانی دێهاتی موسڵمانانیان ڕوانیوەو، بەچەند ناوچەیەکی ژێر ڕکێفی عەسکەرتاری ومەیدانی جەنگ وئاشووبیان داناوە.

تەنانەت لە(بارث)یش توندڕەوتر، کەسێکی وەك(فریدریك بیلی)یە، کە ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە بەڕێکخراوی تیرۆریستی(مافیا) دەچوێنێت.

خەڵکی خێڵەکی بەداب ونەریتی جوامێریی وبەخشندەیی و ڕێزگرتن لەمیوان وغەریبان (تەنانەت گەر ئەوبیانیە ڕۆژهەڵاتناسە قین لەدڵانەش میوانیان

بووبن) ناسراون و، سامانێکی گەورەی فەرهەنگی ومیللیو ئەدەبیشیان بەدرێژایی پتر لەچوار سەدە، بەرهەم هێناوە، کەچی ڕەگەز پەرستێکی وەك (بێلی) دێت بە(مافیا)یان لەقەڵەم دەدات. دیارە وشەی (مافیا)ش ئەدرێسێکی ترسناکەو، لە ڕۆژئاوادا بەو کۆمەڵە دزو جەردەو پیاوکوژانە دەڵێن، کە لەنێو خودی کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوادا پەیدا بوون، نەك لەکۆمەڵگەی ئیسلامیو هۆز و تیرە بەشەرەفەکانیدا.

بێگومان لەوەڵامدانەوەی ئەو هەموو بوختان ودرۆو دەلەسە بەناو (زانستی)یانەی ڕۆژهەڵاتناساندا، زاناو بیریارە موسڵمانەکان درێغییان نەکردووەو، هەزاران لێکۆڵینەوەی زانستییان بەچەندین زمانی بیانی بڵاوکردۆتەوەو، هەموو هەڵەو کەم وکورتییەکی نێو توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژئاوایان دیاری کردووەو، پەردەشیان لەسەر ڕقی شاراوەی نێو سینە تەسکەکانی ڕۆژهەڵاتناسان هەڵداوەتەوە.

بەڕێز(طلال أسعد) لەساڵی (١٩٧٥)دا، ڕەخنەیەکی زانستی لەکتێبی(ئەینەر کۆهین) گرتووە کە ساڵی ١٩٦٦ لەسەر چەند گوندێکی فەلەستینی نووسیوە.

مامۆستا (أكبر.س. أحمد)یش چەند کتێبێکی لەم بارەیەوە بڵاوکردۆتەوە. ناوبراو لەم لایەنەوە گوتوویە: (من لەکتێبێکم دا کە ساڵی- ١٩٧٦- بڵاوم کردۆتەوە پێشنیازی بەکارهێنانی چوارچێوەیەکی فراوانی ئیسلامیم کردووە، کە کاتێك توێژینەوەی کۆمەڵگەی خێڵەکی ئیسلامی دەکەین، با ئیسلام وەك فەرهەنگ وسیاسەتیش لەم جۆرە توێژینەوانەدا بخەینە کار. بەڵام لەبەرانبەردا بەوە تاوانبار کرام، کە هێرشم کردووەتە سەر زانایانی- ئەنسرۆپۆلۆژیا- و- ئیمپریالیزم- هەر وەك- ئەندرسۆن- لەکتێبێکیدا، کە ساڵی ١٩٨١ بڵاوی

کـردەوە، ئـەو تۆمەتانـەی ئاراسـتە کـردم. نووسینی ئـەو کتێبەشـم بـە کارێکی بەربەرەکانی کردنی ئیسلامیانە لەدژی ئەوان لەقەڵەم درابوو).

جــێی باســـە، نابێـــت ڕۆڵ و هەڵوێســـتی نووســـەران و وەرگـــێڕە کوردەکانیشـمان لـەم ڕووەوە فـەرامۆش کـەین، کـە دانـیان بەواقـیعدا نـاوەو، لــەکاری تەرجەمــەی هــەر لێکۆڵیــنەوەو گەشـتنامەیەکی ڕۆژهەڵاتناســانداو لەپێشـــەکی ی بەرهەمـــە وەرگێڕاوەکانـــیاندا، ئاماژەیـــان بۆلایەنـــە ڕاســـت وناڕاستەکان کـردووە. هـەر لـەم ڕووەوە ڕۆڵی نوسەرێکی بەڕەگەز فەلەستینیی وەك (ئـیدوارد سـعید)یـش لەکتێـبە بەناوبانگەکـەیدا (الإستشــــــراق- ڕۆژهەڵاتناسیی) ولەهـەر وتـار و نووسینێکی تریدا، بەڕوونی دیـارە کـە چۆن بەرپەرچی ڕۆژهەڵاتناسانی داوەتەوە. ناوبراو لەبواری زانستی ومرۆڤناسییداو، لەپوختـەی کارەکانیشیەوە بـەو ئەنجامـە گەیشـتووەو کاتـێك پێناسـەی زانـای ئەنسرپۆلۆژي لەسەر ڕیچکەی ڕۆژهەڵاتناسان دەنوسێت ودەڵێت (ئەو مرۆڤێکە تـەنها لـە ڕۆژهـەڵاتدا فـێربووەو لـەوێ نووسـیویەتیو دیراسـەی تـەنها لەسـەر ڕۆژهەڵات هەبووەو هەمان شێوازی ڕۆژهەڵاتناسانی گرتۆتە بەر).

تۆ بڵـێی لەبـەردەم ئـەو هێرشـە نەگریسـە کلتووریەدا، موسڵمانان سەری خۆیـان بخەنـە نێو لمەوەو، لەئاسـت ئـەو فـڕو فـێڵ وبوختانە بەردەوامانەدا، کە تا ئەمـڕۆش هـیچ سـنوورێکی نییـە، خۆیـان کـەڕو کوێـر کـەن ؟ ئایـا هەڵوێسـتی موسڵمانان لەبەرانبەر نووسەرانی کتێبی- هاجەریزم-دا کاتێك هێرش دەکاتە سـەر شەخسـی پێغەمبەری خـودا (ﷺ) و هـەموو بنەماو ڕێسـاکانی ئیسـلامیش دەشێوێنێت چییە ؟ یان کاتێك زانایانی مرۆڤناسییان کۆمەڵگەی موسڵمانان بە(ڕێکخـراوی مافیا) دەشوبهێنن ؟ ئایا دەشێت زۆر بەسانایی موسڵمانان پشت لـەو هەموو دیراسەو لێکۆڵینەوە نـا ڕاستانەی خۆرئـاوا هەڵکەن و واشیان لێ بکەن نەهێڵن بەئاسانیو بەسیمای ئیسلامیانەوە سەردانی ڕۆژئاوا بکەن، نەبادا

ڕووخساری (تیرۆریستانە) یان بناسنەوە ؟ ئایا وا باشتر نییە، کە زاناو پێشەوایانی ئیسلام شەوو ڕۆژ بخەنە سەر یەك و، سەرقاڵی دیراسەی پوخت وزانستیانە بن بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی فەرهەنگی وغەزوی ڕوناکبیریو پاشان داگیرکردنی وڵاتانمان ؟ ئایا زۆر پێویست وگونجاو نییە، کە بیریاران وهۆشمەندانی ئیسلام لەهەموو سووچ و گۆشە و کەنارێکەوە چوارچێوەیەکی شیاو و یەکگرتوو بۆ زانستی مرۆییو توێژینەوەی کۆمەڵناسی داڕێژن وڕوونی بکەنەوە، کە (مرۆڤناسی)و زانستی ڕاستەقینەی (مرۆڤناسی)، تەنها بەپێوەر و تەرازووی دادگەرانەی ئیسلام ڕۆشنایی دەخاتە سەر ژیان وگوزەرانی کۆمەڵگەو ژینگەی بەشەری ؟!.

# ڕۆژهەڵاتناسیی لە قاڵبی هونەر و ئەدەبیات دا

هاوکات لە گەڵ گەشت و توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسیی یەکان دا، چەندین ئەدیبء هونەرمەندی ڕۆژئاواش دەستیان بە سەفەر بۆ ڕۆژهەڵات دەکرد، بە تایبەتیش نیگار کێشەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستەوەبایەخیان بە چەند دیمەنێکی گرنگی کۆمەڵایەتی دابوو. بەڵام ئەم تەوژمە هونەریە تەنها لە سەدەی نۆزدەوە سیمایەکی میللی بە خۆوە گرت.هەر چەندە سەدەیەك پێشتر (واتە لە سەدەی هەژدە)دا هەنگاوێکی زیاتری بۆ پێشەوە نابوو.ئەمەش لە هێرشەکەی (فەرەنسا)دا بۆ سەر (میسر) و، لە جەنگی یۆنانیشدا لە ساڵی (١٨٢١ )داو،دواتر داگیر کردنی- جەزائیر- لە ساڵی (١٨٣٠)دا، چونکە سەرکردە سوپایی یەکان، لە کاتی داگیر کردنی ئەو وڵاتانەدا هەندێك لەهونەرمەندە نیگار کێشەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو، تاکو ئەو هونەرمەندانە باشتر جەنگەکانیان بڕازێننەوەو دیمەنەکانی قارەمانێتیو سەرکەوتنیان بۆ بکێشن، ئەو ڕووداوانەش هەوێنی یەکەمی هونەرمەندی ڕۆژئاوایی بوو، کە(هونەر) بەڕای خۆیان شان بەشانی جەنگ وسیاسەت ڕۆڵی دەبینی، دیارە (قەڵەم وچەك)یش بیروباوەڕێکی تری بۆ نووسەران وشاعیران وجەنگاوەرانیان خولقاندبوو.. هەر لەو سەردەمەشدا ڕێبازی- ڕۆمانسیەت- وەك قۆناغێکی دیکەی ئەدەبی هاتە کایەوەو پرۆسەی بە ڕۆژئاوایی کردنی ڕۆژهەڵاتیش (واتە بانگەوازی تەغریب) دەستی پێ کرد.

نیگارکێشەکانی ڕۆژئاوا کاتێك، لەڕوانگەیەکی سیاسی یەوە وێنەی ڕۆژهەڵاتیان دەکێشا، هەموو دیاردەیەکی توندوتیژیو وەحشی گەری یان دەخستە پاڵ سوڵتان وپادشایانی ڕۆژهەڵات، چونکە دەبوایە لەتابلۆکانیاندا

ڕۆژهەڵات وانیشان بدەن گوایە مەڵبەندی زوڵم وزۆرداری وچەند وڵاتێکی پڕ لەشەڕو ئاشووب وچەند قەسابخانەیەکی بەکۆمەڵە... لای ئەوان ڕۆژهەڵات وڵات وخاکی بێ ئومێدی وسەرگەردانیو چەوساندنەوە بوو. جێی باسیشە سیاسەتمەداران وفەرماندە شەڕخوازەکانی ڕۆژئاوا، بەهیچ شێوەیەك لەو سەردەمەدا ڕێیان بەنیگارکێشەکان نەدەدا، کە لەنزیکەوە ڕاستییەکان ببینن، بەڵکو تەنها فەرمانیان بەسەردا دەدان، کە وێنەی شەڕ و سەرکەوتنەکانیان بۆ بکێشن ودانیشتوانی ڕۆژهەڵات، وەك چەند دڕندەیەك وێنا بکەن. هەروەها ڕۆژهەڵاتناسەکان خۆیان وبەرهەمە نووسراوەکانیان و گەشتنامەکانیان تاکە سەرچاوەی هونەرمەندان وئەدیبان بوون.

لەلایەکی تریشەوە، دەشێت مێژووی هونەر و ئەدەبی ڕۆژئاوا بەگشتی بۆ پێوەندیی نێوان (ڕۆژهەڵاتی موسڵمان) و(ڕۆژئاوای مەسیحی) بگێڕینەوە، واتە: بۆ سەدەی هەشتەمی زاینی وسەردەمی فەتحی- ئیسپانیا- لەلایەن سوپای ئیسلامەوە. بەڵام لە قۆناغی بەرفراوانی ڕۆژهەڵاتناسیی، سەرهەڵدانی هونەرو ئەدەبیات لەسەردەمی ئیمپریالیزمدا، لەو زەمەنەوەیە کە هەردوو چەمکی (ڕۆژهەڵات) و(ڕۆژئاوا) لەسەدەکانی نێوەڕاست وڕۆژگاری جەنگی خاچپەرستیدا. ڕوونتریش بڵێین لەدوای چەرخی (ڕێنیسانس) لە سەدەی شازدەوە هاتنە ئاراوە. لە ڕۆژهەڵاتیشدا ئەو جۆرە هەستە لەساڵی (١٤٥٣) دوای ڕوخانی (قوستەنتینیە)وە خرۆشا. کە وابوو ڕووبەڕووبوونەوەی یەکەم، بەشێوەیەکی فیعلی لەبۆتەی جەنگە ئایینییە خاچپەرستییەکانەوە ڕووی داوەو، ئیدی لەو مێژووەوە یەکەم گڕی دژایەتی نەسرانییەکان بەرانبەر موسڵمانان هەڵگیرساوەو بەم پێیەش ڕۆژئاوا چاوی بڕیوەتە ڕۆژهەڵات.

ئاسەوارە ئەدەبیەکانی سەدەکانی نێوەڕاست بەم جۆرە وەسفی ڕۆژهەڵاتیان دەکرد، کە وەك بەهەشتێکی خودایەو، باخێکی فراوانی پڕ لەگوڵ وبۆنی

خۆشەو، گوڵەکانیش بەلاسکە زێڕینەکانیانەوە و ڕووبارەکانیش بەتام وچێژی هەنگوینی‌یانەوە، سیمای ئەو بەهەشتە دەڕازێننەوە. جگە لەو چوار ڕووبارەش، (ڕووباری ئەردەن- نیل- دیجلە- فورات) کە هێمای ژیان وزیندوویەتین. ئەوان بەم وەسفە ئەدەبی‌یە ڕۆمانسی‌یە (کە هەرگیز لەدەرووی ڕێزلێنان وبەدڵ بوونیشەوە نەبوون) هەموو چین وتوێژەکانی گەلی خۆیان هان دەدا، کە بەبازرگان وگەڕیدەو ئەدیب وهونەرمەندو جەنگاوەریانەوە، ڕوو لەم دیمەنە دڵ فرێنانەی بەهەشتی خودا بکەن وخاکی پیرۆزیش لەدڕندەو جەنگاوەران ڕزگار کەن. نیگار کێشانی ئەورووپا، شان بەشانی ئەدیب وشاعیران، تابلۆی خۆرهەڵاتێکیان دەکێشا، کە لەگەڵ خەیاڵ و میزاجی سەرکردە و جەماوەرە ڕەگەزپەرستەکانیاندا بگونجێت. لەم ڕووەوە هەردوو تابلۆکەی (دێلاکروا) بەناوی (قەسابخانەکانی ساقیز- کە ساڵی ١٨٢٤- کێشاویەتی)و (مردنی- ساردینپاڵ- کە ساڵی ١٨٢٨- کێشاویەتی) [٩٥] باشترین نموونەی بەرجەستەکراوی ئەو خۆرهەڵاتە خەیاڵی‌یەن. ڕۆژهەڵات لەدیدی ئەم هونەرمەندەداو (هەر وەك لەبەرهەمی نووسەرەکانیاندا خوێندبوویەوە) ناوچەیەکی پڕ لەستەم وتوندوتیژی‌یە.

هەروەها لای ئەو(واتە لای /دیلاکروا/) شوێنی ڕووت و قووتی و بەدڕەفتاریە.. خانەی لەش فرۆشی و بێ هۆش کردنی ئافرەتان و، گەنجینەکانی داستانی ئەفسانەیی‌ی ((الف لیلة ولیلة- هەزارو یەك شەو))ەیە. هونەری نیگارکێشان وتابلۆکانیان بە دوو قۆناغدا تێپەڕیوە، یەکەمیان (خەیاڵی) دووەمیان (واقیعی). بەڵام لە هەردوو قۆناغەکەشدا ڕۆژهەڵات ودانیشتوانەکەشی لەپلار و تانەوتەشەری ئەوان قوتار نەبوون. هەر بۆیەش (دیلا کروا)وێنەی چەند قەسابخانەیەکی کێشاوە، گوایە لەنێوان تورك و یۆنانی‌یەکاندا ڕوویان داوە، بەم هۆیەشەوە پەرەی بەو پڕوپاگەندەو

درۆودەلەسانەی سەرانی ئەوروپا دەدا کە لەدژی ڕۆژهەڵات بڵاویان دەکردەوە. لەتابلۆی دووەمیشدا (مردنی ساردینپاڵ) مەبەستی لەو پادشا ئاشورییەیە، کەدوای ئەوەی زانیویەتی خۆیشی هەر دەبێت بمرێت سەرجەم خەڵکی دەوروبەری خۆی کوشتووە.

لایەنێکی تر لەتابلۆی هونەرمەندە ڕۆژئاواییەکاندا، بۆ سووکایەتی بەئافرەتی ڕۆژهەڵات تەرخان کراوە، کە گوایە وەك کۆیلەو کەنیزە سەودایان لەگەڵدا کراوە، دیارە پیاوانیشیان بەچەند کەسێکی تەمبەڵ ودەمارگیر ونەفام وێناکردووە. بەم ڕەنگەش هونەری نیگارکێشانیان لە ڕۆژهەڵاتدا لەسەر سێ تەوەرە بووە (تۆقاندن- و- دەمارگیریو- بەدڕەفتاریی). بەچاوخشاندنێکی خێراش بەتابلۆکانی (دیکان) و(تیۆدۆر شاسیریۆ) و(هیسنری ڕینیو) و(دیهۆدانگ) و(پیکابیا) و(بیندەر) و(ڕیکلۆس)دا، دەردەکەوێت کە چ سیمایەکی تیرۆر و تۆقاندن و ئاشووبگێڕیی و دەمارگیریی خێڵەکی و بەدکاریی و بێئابڕوییان بە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییەوە ناوە. لەبواری ئەدەبیاتیشدا چەندان ئەدیبی وەك(جینکۆ) و(لیکیا شۆبلی) و(ڤیدچکۆ) و(دۆگلاس لاتیۆن) و(ولیەم دۆڤریز) و(مارگرێت ڕۆدنکۆ) و(مینۆرسکی) و(ئەلێکساندەر ژاپا) و(فرانسواز بێرەنژێ) و هاوڕێ و هاوپیشەکانیان، لەئەدەبی گەلانی ڕۆژهەڵاتیان کۆڵیوەتەوەو، خولیای زانستی ئەنسرۆپۆلۆژیی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبییان لەسەردا بووە و شێوە زمان و دایالەکتیك وئیدیۆم و ڕێزمانی نەتەوەکانیان کۆڵیوەتەوە [٩٦].

❁❁❁

# پوختەی توێژینەوەو بڵاوکراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان

لەم بارەیەوە دەشێت بڵێین، کە زۆربەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو گۆڤارو بڵاوکراوەکانیشیان، لەسەر مەنهەجێکی دیاری کراوی زانستیانە نەبووە، بەڵکو تەنها وەك ڕوانینێکی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات لە دەروویەکی لووتبەرزیی وشێواندنی عەقیدەی خەڵکیەوە بووە. بەڕێز (ڕۆبەرت کرین) کە ڕاوێژکاری سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا (نیکسۆن) بووەو، لەم ساڵانەی دواییدا موسڵمان بووەو، ناوی خۆی بۆ (فاروق عبدالحق) گۆڕیوە، لەوتارێکی بڵاوکراوەیدا دەربارەی(ڕۆژهەڵاتناسیی) دیراسەو لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکاني کردوونەتە سێ بەش:

١. ئەو لێکۆڵینەوە زانستیو بابەتیانەی، کە هەندێك زانای ئەڵمانی نووسیویانەو، ڕەچاوی دادگەریو باری ڕاستیی مەسەلەکانیان کردووە، یان بەئەمانەتەوە چەند کتێبێکیان تەرجەمە کردووە.

٢. ئەو لێکۆڵینەوانەی بەپاڵنەری سیاسەتی دەرەکی نووسراون، واتە: ئەو توێژینەوەو دیراسانەی بەفەرمانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا نووسراون، یان بەفەرمانی دەزگاکانی سیخوڕییو هەواڵگریی(مخابرات)ی ڕۆژئاوا نووسراون، ئەرکی دارایيو سەرپەرشتی کردنیان گرتوونەتە ئەستۆو، جیهانی ئیسلامییان تێدا شێواندووە.

٣. ئەو دیراسانەی کە موژدەهێنە مەسیحییەکان ئامادەیان کردووەو تێیاندا ویستوویانە بەهەر ڕێگەیەك بێت، هێرش بکەنە سەر ئیسلام.[97]

پاشان بەڕێز (فاروق عبدالحق) دەڵێت:(دەشێت بڵێین هێشتا ڕۆژهەڵاتناسیی

تەواو نەبووە، بەڵکو بەرجەستە کردنێکی نوێی بۆ هەیە بەناوی (تێزە شارستانییەکان)ەوە، ئەمەش چەمکێکی بنەڕەتییە کە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا پشتی پێ دەبەستێت)[٩٨]. کەوابوو:- پێویستە گەندەڵی وترسناکیی تێزە کۆلۆنیالییەکان لەبواری ئەنسرپۆلۆژي و ڕۆژهەڵاتناسیی ئاشکرا بکرێت، کەئەم تێزانە لەدەرەوەی هەرچەشنە بەهایەکی ئەبیستمیدا کاردەکەن و، دەخوازن بەشوێن شوناسی لۆجیکی وعەقلانی هەولە کۆلۆنیالییەکانەوە بن. لەدیدگای ئەم توێژینەوە ئەبیستمی وزانستییانەوە، دەتوانین تێگەیشتنێکی دروست بەرانبەر ڕۆژئاوا فۆرمەلە بکەین. یان دەتوانین لەچییەتی ڕۆژئاوا تێبگەین وبیانناسین. لەوێشەوە ئەتوانین سیستەمێکی تۆکمەبوونی تیۆری ومەعریفیمان دابڕێژین)[٩٩].

ڕۆژهەڵاتناسان لە لێکۆڵینەوەکانیاندا ویستوویانە مۆرکێکی زانستیو بابەتیانە بەزۆربەی نووسراوەکانیانەوە بنێن، لەکاتێکدا لەڕێبازی زانستی و بابەتیانە تەواو دووربوون ئەوان تەنها تیشکیان خستووەتە سەر بیروڕا تایبەتیەکانی خۆیان و، لەچاوێلکەی کورتبینی خۆیانەوە باری ڕاستی مەسەلەکانیان تاووتوێ کردووە. لەم دیراسانەیان و، هەروەها لەگۆڤارو کتێب وبڵاوکراوە هەمە جۆرەکانیشیانەوە، ڕوون دەبێتەوە کە چۆن بۆ نێوفیکری خەڵکی دزەیان کردووەو، لەچ غەزوێکی فیکرییەوە ڕێیان بۆ داگیرکردن ودوژمنکاری خۆش کردووە. ئەم جۆرە عەقلییەتە لەشێوازی لێکۆڵینەوەو نووسینەوەی سیاحەتنامەشدا، درێژبوونەوەی هەمان عەقلیەتی ئەورووپییە لەچەرخی(ڕێنیسانس)یشدا (کە وا کەسانی بەناو نوێ خوازی ئەورووپا، لەوانەی دژی- کەنیسە- ڕاپەڕیبوون) مەبەستیان لێکۆڵینەوەی دیانەتی شەرقی نەبووە، بەڵکو هەر بەهەمان دیدو بۆچوونیان لەسەر مەسیحیەت وخاچپەرستێتیی هەردوو سەدەی شازدەو حەڤدەوە، بۆ ئیسلامیان دەڕوانی و کە دوای کۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی کەنیسەش، مۆرکێکی

دنیاپەرستی(عەلمانیەت)یان بەکۆمەڵگەکانی خۆیانەوە ناوە. جا ئەگەر جیهانی ئیسلامی لەپێش سەردەمی (ڕێنیسانس)ی ئەوروپادا، بەرەو ڕووی شالاوی فیکری چەند ڕۆژهەڵاتناسێکی مەسیحی توندڕەو بووبێتەوە ئەوا هێندەی نەبردووە، کە دوای چەرخی (ڕینیسانس)یش بەرەو ڕووی هەمان شالاوی چەندان ڕۆژهەڵاتناسیی (عەلمانی) توندڕەو بووەتەوە. بەڵام وەك ووتمان قۆناغی عەلمانیەکانیش هەر درێژە پێدانێکی ڕاستەوخۆی هەمان عەقلیەتە ئەوروپیە ديندارە کە بوو، کە بەبەرگێکی مەسیحی خاچپەرستیو بەهەمان ئەزموونی پێشووترو بە هەمان مەبەستی پێشویانەوە ڕۆژهەڵاتیان دەپشکنی.

لێرەش دا بەکورتی ئاماژە بۆ چەند دیراسەو لێکۆڵینەوەو گۆڤارو بڵاوکراوەیە کێشیان دەکەین، کە لەهەردوو سەردەمی پێش ڕاپەڕین (ڕینیسانس)و دوایی (ڕێنیسانس)یش هەمان بابەت و نێوەڕۆکی لەیەکچوویان لەخۆ گرتوە [١٠٠]، بۆ نمونە یەکێکی وەك:-

(ڕینان)ی فەرەنسی، لەتوێژینەوەکانیدا دەڵێت: (فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی هەر فەلسەفە یۆنانیەکەیە، بەڵام بەپیتی عەرەبی نوسراوەتەوە. (ڕینان) یەکێك بووە لە لایەنگرانی (دوزی) و حوکمە توندوتیژە ناسامیەکانی، کە لەهەر چوار بەرگی کتێبی (دوزی)دا هەیە بەناوی (موسڵمانانی- ئیسپانیا- تافەتحی- ئەندەلوس). هەروەها یەکێکی وەك (ڕاینهارت دوزی) لەساڵی (١٨٨٣ز)دا، وای دانا بوو کە قورئان چێژێکی زۆر تاڵ و خراپی هەیەو، شتێکی تازەی تێدا نیەو، لەچەند مەسەلەیەکی قورس و وەڕسکار پێك هاتووە. (جۆرج سیل)یش لەساڵی (١٧٣٦ز) لەپێشەکیەکی تەرجەمەی ماناکانی قورئاندا وای داناوە گوایە قورئان لەلایەن خودی (محمد)ەوە دانراوەو، هیچ گومانێکیش لەمەدا نیە. ڕۆژهەڵاتناسانی فەرەنسا لەشیتەڵ کردنەوەی هێماکانی (زەند)و (ئاڤێستا)دا، ڕۆڵێکی سلبیان گێڕاوەو، تەنانەت لەدەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا شاری (پاریس)ی پایتەختیان کردبووە سەنتەرێکی

لێکۆڵینەوەو دیراساتی- سانسکریتی-. لەمەش دا هۆی بایەخدانی (ناپلیۆن) بەڕۆژهەڵات بەپێشبڕکێیانەوە لەگەڵ- بەریتانیا- کاتێك هندستانی داگیرکردبوو بەند بووە. دیارە بایەخدانی فرەی ئینگلیزەکان بەڕۆژهەڵاتی دوورو نیمچە دورگەی هیندی، کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەر بایەخدانی فەرەنسا بەڕۆژهەڵاتی نزیك و بەنەتەوەی عەرەب و نەتەوە موسڵمانەکانی تری ناوچەکە هەبووە. لەڕاپۆرتێکی (ئۆمپیسي گۆ)ی وەزیری کۆلۆنیالەکانی بەریتانیادا، کە ڕۆژی (٩/١٢/١٩٣٨) بۆ سەرۆکی حکومەتەکەی ناردوە، باسی وەحدەتی ئیسلامی کراوە، کەچۆن لەلایان بووەتە مەترسی‌یەکی گەورە لەسەر ئیمپراتۆریەتەکەیان، تەنانەت لەسەر فەرەنساش. لەدوایش دا خۆشحاڵی خۆی بەوە دەربڕیوە، کە سیستەمی- خەلافەت- لەئارادا نەماوەو، هیوای خواستووە کە هەرگیز لەمەولا ئەو سیستەمە بۆ جیهانی ئیسلامی نەگەڕێتەوە.

(شیلدۆن نامۆس) دەڵێت: (شەریعەتی- محمد- هەر ئەو یاسا ڕۆمانیەي ئیمپراتۆریەتەکەی ڕۆژهەڵاتە، کە بەگوێرەی حاڵەتی سیاسی لەناوچە عەرەبی‌یەکاندا بەکار دەهێنرا)، هەروەها دەڵێت: (یاسای- محمدی- تەنها یاساکەی "جیستینیان"ە لەبەرگێکی عەرەبی)دا. (لویس ماسینیون)یش لەدیراسەیەکی‌دا، ئیسلام وا لەقەڵەم دەدا گوایە بۆ بەرهەڵستکاریەکی ڕێکخراوی دانایانەی (ئاینی مەسیحی) دروست کراوە. (ماسینیۆن) سەرکردایەتی ئەو بزاڤە میللیەشی دەکرد، کە تەقەللای نوسینی لاتینی‌یان دەدا. ناوبراو بەناودارترین ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسە دادەنرێت لەدژایەتی کردنی ئیسلامدا. بەڕای ئەو پاڵەوانی گەورەی ئیسلام نە (محمد)ەو نە (إبن ڕشد)و نەزانایەکی تر، بەڵکو تەنیا- حەللاج- ە. لای- ماسینیۆن- حەللاج- ئەو- قدیس- ـە موسڵمانەیە، کەموسڵمانە سونی‌یەکان بەهۆی ئەو هەموو بوێری و جورئەتەی لەسەر شەخسانی کردنی ئیسلام لەخاچیان داوە[101]. دیارە لای ئەوان شەخسی پێغەمبەری ئیسلام.(ﷺ) بەلاوە نراوەو، یاخی‌یەکی وەك

(حەللاج) لەپلەیەکی بەرزدا دانراوە، چونکە خۆی بەکەسێتیەکی وەك (مەسیح) چوواندووە. ڕۆژهەڵاتناسێکی وەك (گرۆنباوم)یش، لەکتێبی (شارستانیەتی ئیسلام) دا دەڵێت: (ئیسلام لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە دانی بەڕێزی مرۆڤدا نەناوە، تەنها بەنەختێکیدا نەبێت. قورئانیش دەیەوێت مرۆڤ بەو قەناعەتە بگەیەنێت، کە بەچاوی سووك سەیری بونیادی جەستەیی خۆی بکات) [١٠٢].

گۆڤار و بلاوکراوەکانی "ڕۆژهەڵاتناسیی"یش، هەر بۆ ئەو مەبەستانە تەرخان کراون، کە چەندین وتارو لێکۆڵینەوەی نادروستیان لەسەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی تێدا نووسراوەو، پتر لەسێ سەد گۆڤارو بلاوکراوەی هەمە چەشن لەچەندەها زمانی دنیا دەرچووەو، تا ئەمڕۆش دەردەکرێن، وەك [١٠٣]:-

١- گۆڤاری (جیهانی ئیسلامی) (The Muslim World) کەساڵی (١٩١١ز) (سامۆئیل زویمەر) لەبەریتانیا دایمەزراندووە. ناوبراو سەرۆکی موژدەهێنان (مبشرین)ی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بووە.

٢- گۆڤارێکی تر بەهەمان ناو لە(پوترس بۆرگ) لەساڵی(١٩١٢) ەوە دەرکراوەو، چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچووە.

٣- گۆڤاری (سەرچاوەکانی ڕۆژهەڵات) کە- هامەر بیرکشتاڵ)- لە(ڤیەننا) لەساڵانی نێوان (١٨٠٩ - ١٨١٨)دا دەری کردووە.

٤- ساڵی ١٨٩٥یش لە- پاریس- گۆڤارێك بەناوی (ئیسلام) ( _ Al Islam) دەرچووە و پاشان لەساڵی ١٩٠٦ دا گۆڤاری (جیهانی ئیسلامی)ی بەدوادا هاتووە، کە (نێردەی زانستی فەرەنسی) لە- مەغریب- دەری کردووە. دوایش ئەم گۆڤارە، (دیراساتی ئیسلامی) گۆڕاوە.